# شتێك بكە ....
# هەر شتێك!

## دلاوەر قەرەداغی



شتێك بكە
بۆ نموونە
فوو لە چراكە بكە
تا باڵندە و درەخت و گیا و ڕووناكی
پێڵوو لێكنێن و بزانن كە ئیتر درەنگە،
بەڵام رۆژێكی تازەیان لە پێشە

شتێك بكە
بۆ نموونە
بەیانیان ئینجانەكان بگوێزەوە
بەر هەتاو





تا خۆر تاقەتی بێ هەڵبێ
تا متمانە بە خۆی
پەیدا بکاتەوە و
بزانێ کە هەبوونی ئەو چەندە
پێویست و گرنگە .... بۆ ئێمە

شتێك بکە
بۆ نموونە زەمیلە بچنە
تا قۆخ بیری بێت پێ بگا
تا هەناری ترش بزانێ
کە هەمیشە
لە زەینی ئێمەدا
چ خەیاڵێکی بێ ئەندازە مێخۆشە!

شتێك بکە
بۆ نموونە ڕوانین بدە بەدەم
ڕستەی جوان جوانەوە
تا پەنجەرە

لەوەندە زیاتر دڵی نەشکێ و
دڵنیابێ کە ئەوەی ئەو بە ڕوویدا کراوەتەوە،
خۆشمان دەوێ و وەك دڵ نزیکە
لێمانەوە

شتێك بکە
بۆ نموونە گوڵ ببە بۆ پیاسە
تا باخ لە بڕیاری سەفەر پەژێوان بێتەوە و
بزانێ کە ئەگەر ڕۆژێك نەیبینین
لەبەرخۆمانەوە دەڵێین:
خۆزگە لێرە بوایە
ئای .... چەند بیری دەکەین و
جێگەی دیارە!

شێك بکە
بۆ نموونە
بڕۆ سەر جاددە و دەست لە پاسی
شارێکی دوور ڕابگرە
تا ماڵێکی غەمگین
لە خۆشیدا ڕاچڵەکێ و
بزانێ
کە ئێجگار ئەوەندە تەنیا و
گۆشەگیر نییە و
جار بە جار میوانێك
بەرەو لای دێ!





شتێك بكە
بۆ نموونە
خۆت بە هۆنینەوەی
ملوانكەیەكی پچڕاوەوە بخلافێنە
تا بووكەشووشە مۆنەكەی سەر تاقەكە
بزە بیگرێ و
بزانێ ژیان
هێشتا هەر جوان و بەردەوامە و
هەوڵێكی بچكۆلانە و گرینگ هەیە
كە تا كار لە جوانیی نەترازاوە،
ڕیتمی دڵ و
هارمۆنیای ڕوانینمان ڕێكخاتەوە!

شتێك بكە
بۆ نموونە
بە پەیژەكەدا بڕۆ سەربان
تا كۆترەكان
ئەوەندە زۆر
دڵیان لە خۆیان دانەمێنێ و
هەست نەكەن ئێجگار
ئەوەندە

کوردانە
غەریب و تاکوتەنیان!

شتێك بکە
بۆ نموونە بڕۆرە بەرباران
تا هەور و با و بروسکە
هەست بە بوونی خۆیان بکەن و
دڵنیابن
هێشتا هەر
سێ خوشکە بچکۆلە و ئازیزەکەی
ڕۆژانی تەنگانە و
غەریبیی ئێمەن!

تۆ دەبێ شتێك هەر بکەیت
بۆ نموونە ناوبژییەك
قسەیەك
سەمایەك
فێڵێك
زریکەیەك
فیکەیەك
سەفەرێکی کورت
یان ڕاوەستان بە سەعات لەبەر پەنجەرە
یاخود دەستنانێکی درێژ بە زەنگی دەرگادا
تا هەڵەیەك ڕاست کەیتەوە





تا برینێك سارێژ كەیت
تا گۆزەیەكی شكاو چاك كەیتەوە
تا دڵێكی زویر لەگەڵمان ئاشت كەیتەوە
تا شتێك ... شتێكی زۆر گرینگ
كە دەمێكە لێمان بزر بووە،
بدەیتەوە!

تۆ دەبێ شتێك بكەی
هەر شتێك!

گۆتینبێرگ
سەرەتای ٢٠١٣

# تەنهایی .. لەبەر خۆیەوە

دڵسۆز حەمە
ئوترێخت ٢٠١٢



لە مەغریبە جەستەم و
لە مەشریقە ڕۆحەکەم،
لە ئاسماندایە خەیاڵم
لەسەر زەمینە تەماشام،
لە ڕۆحدایە ئازارم و
لە تەنهاییمدایە کە دەمرم.
پیاوێکم دەویست وەکو برا میهرەبان و
وەکو باوك بەخشندە و
وەکو مەهدی دورەدەست و جاویدان بێت؛
خەیاڵم ڕەوشەن کاتەوە
پیاوێك لە سێبەری خودا
سەرلەنوێ نەخشەم بکێشێ و
پارچەکانم کۆکاتەوە .

لەبەردەم پیاوی دنیادا
دەرگایەکی قفڵدراو
شاخێکی داگیرنەکراو و
ڕوبارێکی ڕامنەکراو و
خەمێکی  مات ولوتبەرزم؛
لەبەر پەنجەکانی  تۆدا
ڕێگایەکی  پان و بەرین
دەرگایەکی لەسەرپشت و
باخچەیەکی کراوەیە ڕۆحم،
وڵاتی خۆتە ژنێتیم.

ژوانی من و تۆ
پێکەوەبونی من و تۆ
باوەشگرتنی من و تۆ
پاڵکەوتنی دوو  وەرزە  بە تەنیشتی یەکترەوە،
یەکێکیان ئەمشەو دەبێت بێت
ئەوی دی  هەر ئەمشەو  دەڕوات،
بێ  هاتنی تۆ  من نایەم
بە گەشتنی من چەند زوو دەڕۆی تۆش!



چاوت  ماچ  دەکەم
ئەمساتەوەختە کە ئەم ووشانە دەبینیت
پەنجەکانت ماچ دەکەم



که دوگمەی مۆبایلەکەت دەگۆڕیت و
کورتە نامەکەم دەخوێنیتەوە؛
لێوەکانت ماچ دەکەم
کە لە کۆتایی ئەم وشانەدا
بزە دەکەوێتە سەریان.



دارسێوە بەربادەکە
دارسێوە نائومێد و تەنهاکە
دڵی وەکو کۆلارە بە ئاسماندا هەڵداوە،
بێباك لەوەی چەتونەکانی گەڕەك
چۆن دەیدەنە بەردەستی زبری( با ) و .. پێدەکەنن
وەکو تۆپ لەکۆڵانە سیلاویەکاندا چۆن چۆنی
لە بەرپێکاندا دێت و دەچێت و نائومێدانە دەگەڕێتەوە،
کەس لە دووی دڵ ناگەڕێت لێرە
بۆیە هێواش هێواش دڵی  هەزار پارچەی ئەویش
بۆگەن دەکات لە سنگدا .

چەندە بە تۆ دەچم  کەرکوك
جوان  وسەنگین و پڕ ژیان
چەندە بە من دەچیت کەرکوك
تەنها وچۆڵ  وهۆڵ  و پڕ ئازار
چەندە بە تۆ دەچم  کەرکوك
بەخوڕترین  نەزیف

و
بەخشندەترین خاك  و خۆڵ
چەندە بە من دەچیت  کەرکوك
بەو  هەموو  جوانیەتەوە
تەنهاترینیت
هەمو عاشق وجەنگاوەر و حیزب و شاسوارەکانت
درۆیان کرد،
تۆ هەر  خۆتی بە کەناری  سوتانەوە
منیش  هەر خۆم  لە زیندانی تەنهاییدا

من  کە لە پێستی  لەشی  خۆم زیاتر ،کەسم نییە
لە دیواری شوشەیی تەنهایی زیاتر .. ماڵم نییە
من کە وەکو جەرگیشم کون کونە ،بەلەمەکەم
بێکەسترین درەختی  دارستانەکەم
سێ باڵندە ،
سێ  سەرنشینی تریشم
بۆ هێناوە  لەگەڵ  خۆمدا؟

بە جوڵەو سەربادانی درەختەکاندا
دیارە لەگەڵ (با) شەڕیانە
یان پێکەوە غەزەل دەخوێننەوە .



ئەدەبی سەردەم





# ئەمەریکا

**نوسینی: ئالەن گینسبێرگ**
**وەرگێڕانی: ڕوونبیر**

ئەمەریکا !هەموو شتێکم پێداویت و، تەواو هیچم پێ نەماوە.
ئەمەریکا دوو دۆلار و بیستو حەوت سەنت لە بەرواری حەڤدەی کانونی دووەمی هەزار و نۆسەد و پەنجا و شەشدا.
ناتوانم بە هیچ کلۆجێك ئەقڵی خۆم بوەستێنم.
ئەمەریکا باشە کەنگین واز لە شەڕی دژە مرۆڤ دێنین؟
برۆ بۆمبی ئەتۆمیەکەت لە خۆت ڕا کە.
ئەوەندە دڵم خۆش نییە، بێزارم مەکە.
تاکو مێشکم نەیەتەوە سەر خۆی ئەم



شیعرەم تەواو ناکەم.
ئەمەریکا، کەنگین وەك فریشتەت لێ دێت؟
کەنگین جلەکانت لە بەر خۆت دادەکەنی؟
کەنگین لە نێو گۆڕەوە تەماشای خۆت دەکەی؟
کەنگین دەبیە شایانی ئەو ملیۆنان، ترۆتسکیەت؟
ئەمەریکا لە بەرچی کتێبخانەکانت هەموویان تژین لە فرمێسك؟
ئەمەریکا کەنگین هێلکەکانت ڕەوانە دەکەیت بۆ هیندستان؟
ئەو هەموو پێشمەرجە شێتانەت نەخۆشم دەخەن.
ئەمەریکا کەنگین وات لێدێت کە چوومە سوپەرمارکێتێك
هەرچی ویستم بیهێنم و بە پێگوتنی»تۆ زۆر جوانی ها!«یەك
حەقەکەی بدەم؟
دواجار هەر ئەمن و تۆین پێرفێکت بین نەك جیهانی داهاتوو.
ئەو هەموو مەکینەکارییەت بێ تامی کردووە.
وات لێکردم ویستی ئەوەم پەیدا بێت کە ببم بە کەسێکی پیرۆز.
ئاخر خۆ دەبێ شتێك هەبێت ئەم گفتوگۆیەی پێ یەکلایی
بکرێتەوە
بۆرۆگس ها لە تەنجە و قەت لەو بڕوایەش دا نیم بێتەوە.
بەڕاستمە ها!
باشە ئەتۆ هەرگیز بە ڕاستیت بووە یان ئەوەش یەکێکە لە قسەخۆشە
سەرپێیەکانت؟
هەموو هەوڵێکی خۆمم خستۆتە گەڕ تا بێمە سەر ئەسڵی بابەت.
بە هەموو شێوەیەك ڕەتی دەکەمەوە لە بابەتەکە لا بدەم.
ئەمەریکا بەسە هیچی دی پاڵم پێوە مەنێ، خۆم دەزانم خەریکی چیم.
ئەمەریکا! کڵوکە هەلووژە خەریکی هەڵدەوەرینن.
چەند مانگە ڕۆژنامەم نەخوێندووەتەوە، هەموو ڕۆژێ کەسێك بە تاوانی
کوشتن دەبرێتە بەردەم دادگا.



ئەمەریکا، بەزەییم بە وۆببلییس دا دێتەوە.
ئەمەریکا من بە منداڵیی کۆمەنیست بووم و داوای لێبوردنیشت لێناکەم.
هەر بۆشم بلوێ، ماریجواناياپەك دەکێشم.
ڕۆژ هەتا ئێوارە لە ماڵەوە دادەنیشم و چاوان دەبڕمە گوڵی نێو پەردە.
کاتێك دەچم بۆ چایناتاون هەموو جارێ تا مەست دەبم دەخۆمەوە، بەڵام هەرگیز سەرجێیەکم دەست ناکەوێ.
لەوەی تێگەیشتوومە کە ئێستا نا ئێستا دەبێتە هەڵلا.
خۆزگە دەتبینیم کاتێك مارکسم دەخوێندەوە.
دەروونزانەکەم دەڵێ کە هیچ تەختەم نوقستان نین.
نوێژی پاتەر نۆستەر ناکەم.
من ڕوئیاگەلی ئەفسوناوی ئەفسوناوی و لەرزگەلی گەردونی گەردونیم هەن.
ئەمەریکا! ئێستاشی لە گەڵدا بێت پێم نەگووتووی چ کارێکت بە خاڵە ماکسی کرد کاتێك کە لە ڕوسیاوە هات.

لە گەڵ تۆمە لە گەڵ تۆ!
ئایا خەریکیت جڵەوی ژیانی سۆزداریمان بدەیتە دەستی تایم مەگەزین؟
تایم مەگەزین گیرۆدەی کردووم.
هەموو هەفتەیەك دەیخوێنمەوە.
هەر کاتێك بەلای شیرینیفرۆشەکەی سەرکۆڵاندا تێدەپەڕم وێنەی سەر بەرگەکەی مۆڕەم لێ دەکات.
هەموو جارێك لە ژێرزەمینەکەی کتێبخانەی گشتیی بەرکلییدا دەیخوێنمەوە.
هەمیشە لە مەڕ بەرپرسیارێتی بۆم دەدوێ. بیزنسمانەکان جددین. فیلم-بەرهەمهێنەکان جددین. هەموو خەڵك جددین ، ئەمن نەبێت.



وا دیارە ئەمن بۆ خۆم ئەمەریکام.
دیسانەوە دەربارەی خۆم قسە دەکەم.

ئاسیا وا لە دژم ڕادەپەڕێ.
چانسی پیاوێکی چینیشم بۆ نەماوەتەوە.
باشترە تۆزێکیش دەربارەی سامانە نەتەوەییەکانم بدوێم.
سامانە نەتەوەییەکانی من بریتین لە دوو گرام تریاك، ملیۆنەها ئەندامی زاوزێ و ئەدەبیاتی تایبەتیی بڵاونەکراوە کە خێراییەکەیان هەزار کیلۆمەتر و کاتژمێر و بیستوپێنج هەزار ئەنستیتۆی دەروونیە.
ئەوە بەبێ باس کردنی زیندانەکانم، یان ملیۆنانی هەژارانم کە لە نێو فنجانەکانمدا دەژین بە ژێر تیشکی پێنج سەد دانە خۆرەوە.
قەحپەخانەکانم لە فەڕەنسە داخستووە و دوای ئەوەش سەرەی ئەوانەی تەنجە دێ.
ئامانجی من ئەوەیە کە ، سەرەڕای ئەوەی کە کاسۆلیکم ، ببمە سەرۆکی وڵات.

ئاخر ئەمەریکا ئەمن چلۆن بتوانم دوعایەکی پیرۆزت بۆ بنوسم بەو هەموو شێتیەتەوە؟
ئەمنیش هەر بەردەوام دەبم لە نووسینی بەیتەکانم کە وەکو سەیارەکانی هێنری فۆرد خودگەران، تا هەریەکەیان ڕەگەزێکی تایبەت بە خۆیان دەبێت.
ئەمەریکا بەیتەکانمت پێ دەفرۆشم دانەی بە دوو هەزار و پێنج سەد دۆلار، با پێنج سەد دۆلاریش خاتری بەیتە کۆنەکەت بێت.
ئەمەریکا تۆم موونی ئازاد کە.
ئەمەریکا لۆیالیستە ئیسپانیەکان ڕزگار بکە.
ئەمەریکا ساککۆ و ڤانزێتتی نابێت بمرن!



ئەمەریکا من کوڕانی سکۆتسبۆرۆم.
ئەمەریکا کاتێك کە من حەوت ساڵان بووم دایکم لە گەڵ خۆیدا بردمی بۆ کۆبوونەوەی داخراوی کۆمەنیستەکان، بە بلیتێك پڕی مشت لۆبیامان دەدرایێ، هەر بلیتەی بە پێنجفلسیەکی بوو و وتارەکان ئازاد بوون و هەموو وەکو فریشتان بوون و هەر خوا بزانێ چەند کرێکارانیان خۆش دەویست و ئەوەندە ڕاستگۆبوون هەر مەپرسە هەتا ئێوارێ خۆت ماندوو کەی نازانی حیزب ساڵی ١٩٣٥ شتێکی چەند باش بوو، سکۆتت نییرینگ مامەپیرەیەکی ئەوەندە بەڕێز بوو بۆ خۆی شەڕەفمەندێکی تەواو بوو و جارێکیان مەزەر بلوو  هێنامیە گریان کە ئیسرایل ئامەرم دیت کە لە نزیکی خۆمەوە ڕاوەستابوو. حەتمەن ئەوانە دەبێ هەموویان جاسوس بووبن.
ئەمەریکا لە ڕاستیدا ئەتۆ ناتەوێت شەڕ بکەی.
ئەمەریکا ئەوە ئەو ڕووسە بەدکارانەن.
ئەو ڕووسانە ئەو ڕووسانە و ئەو چینیانە. هەروەها ئەو ڕووسانە.
ڕووسیا دەیەوێت بە زیندوویی بمانخوا.
گەورەهێزی شێت ڕوسیا. دەیەوێ سەیارەکانمان لە گەراجەکانمان دەرێنێ تا بۆ خۆی بیانبا.
وێ دەیەوێ شیکاگۆ بۆ خۆی بپچکرێ. پێویستی بە باشترینێکی سوور هەیە. دەیەوێت کارگەی سەیارەکانمان ببات بۆ سیبریا. ڕووسەکان بیرۆکراتی گەورە گەورە، کۆنترۆڵی بەنزینخانەکانمان بکەن.
زۆر خراپ، هەیرۆ! وی هیندیە سوور دەیەوێت بکات فێری خوێندەواری. وی پێویست هەیە بە قولەڕەشی زەبەلاح زەبەلاح . وەی! وێ دەوێ هەریەکێکمان ڕۆژی شانزە سەعاتان ئیش بکەین.
فریامان کەون!
ئەمەریکا کورە ئەوە زۆر جیددیە!
ئەوە ئەو تێگەیشتنەیە کە بە هۆی تەماشاکردنی
تەلەفیزۆنەوە وە دەستم هێناوە.
ئەمەریکا ئەوە ڕاستە یان نا؟
باشترە ڕاستەوڕاست بچمە سەر ئیش.
ئەوە ڕاستە کە من نە دەمەوێت بچمە
خزمەتی سەربازی و نە دەشمەوێت لە بەشی



ڕێکوپێك کردنی کارگەیەکدا پارچە تەختە هەڵگێڕ و داگێڕ بکەم، چونکە یەکەمیان نزیکبینم و دووەمیشیان کەسایەتییەکی سایکۆپاتم هەیە.
ئەمەریکا ئەوە منیش قۆڵە حیزانەکەم دەدەمە بەر چەرخەکە و دەکەومە پاڵدان.



سەرچاوە:
america.html/٨٨/http://www.writing.upenn.edu/~afilreis

# دوو چیرۆك

## بۆ دوو چیرۆك و دوو چیرۆكنووس؟

لەم ژمارەیە و ژمارەکانی داهاتووی گۆڤاری ئەدەبی سەردەمدا هەر جارە و داوا لەیەکێک لە چیرۆکنووسە دیارەکانی ناو دنیای ئەدەبی کوردی ئەکەین، کە یەکێک لە باشترین و خۆشەویسترین چیرۆکی خۆیمان بۆ بنێرێت، لەگەڵ چیرۆکی چیرۆکنووسێکی تردا کە لە یەکێک لە هەستیارترین قۆناغەکانی نووسینیدا کاریگەری گەورەی لەسەر بیرکردنەوە و ئەزموونی داناوە؛ لە هەمان کاتدا داواش لەو چیرۆکنووسە کوردە ئەکەین کە خۆی وەک نووسەرێک بۆمان بنووسێت کە بۆچی ئەم چیرۆکەی خۆی لەناو هەموو چیرۆکەکانی تردا بەتایبەت و سەرکەوتوو ئەزانێت، لەهەمانکاتیشدا هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو چیرۆکەی چیرۆکنووسەکەی تریشمان بۆ باسبکات. ڕەنگە ئەم باسکردنە هەندێک نهێنی لەگەڵ خۆی بهێنێت و هەندێک جاریش لەگەڵ تێڕوانینی ڕەخنەگراندا یەکنەگرێتەوە، بەڵام دیدێکی ئینسانی تر و خوێندنەوەیەکی ترمان ئەخاتە بەردەم کە ڕەنگبێت ئێمەش وەک خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەو بابەتانەدا درکی پێنەکەین؛ دیارە ئەم پرۆسەی بەقسەخستنەش هەم ئێمە زیاتر ئاشنای ئەزمونی هونەریی و ئینسانی ئەو چیرۆکنووسە ئەکات، هەم ئەم کارەش ڕەنگە هێندەی خودی بەرهەمە نووسراوەکە سود بە پرۆسەی نووسین و خوێندنەوە بگەیەنێت.



# هەموو شوێنێ بێ ژێر باران جەهەنەمە، تەنانەت بەهەشتیش

خودایە وا بکە دوو جار دوو نەکاتە چوار
ئیڤان تۆرگێنیف

نووسینی: ئارام کاکەی فەلاح
ستۆکهۆڵم، فیبرواری ٢٠١٣

١

بۆچی من چیرۆکی باوکی ناو تەلەفۆنم هەڵبژارد؟ پرسیارێکی زەحمەتە، بۆیە لێرەدا من زۆر هەوڵ نادەم وەڵامی بدەمەوە، چونکە هەست دەکەم وەڵامدانەوەی پرسیاری وا تەواو لەم پەندە رووسییە دەچێ کە دەڵێ قەت





بەدوای پشیلەیەکی ڕەشدا ناگەڕێم
لەژوورێکی تاریکدا، بە تایبەتی گەر
پشیلەکەشی لێ نەبێت. هەڵبژاردنی
ئەم چیرۆکە هەر ئەوە نییە کە
لەهەموو چیرۆکەکانی ترم خوشتر بوێ،
هی ئەوە نییە کە ڕەنگبێ لە هەموو
چیرۆکەکانی تر منی نووسەری زیاتر
تیابێت، ڕەنگە هەڵبژاردنەکەی هی
ئەوە بێت کە من توانیم گەمەیەکی
جیاواز بکەم لەوەی تا ئەو کاتە لە
نووسیندا کردبووم. هەرچەندە من
لە نووسینەوەی دڕکەوە ئیتر وەك
جاران نەمدەنووسی، کاراکتەرێکی
وەك غەریب ریکۆرد لە ئەزموونی
نووسینی مندا یەکلا کەرەوە بوو،
بەواتای تر، ئیتر من قەت وەك پێش
غەریب ریکۆردم نەنووسییەوە. بەڵام
باوکی ناو تەلەفۆن تەواو دەرگایەکی
جیاواز بوو هەر کە کردمەوە و چوومە
ناوی، ئیتر قەت نەهاتمە دەرەوە،
کاتێك هاتیشمە دەرەوە وەك نەهاتمایە
دەرەوە وابوو، چونکە قەت وەك پێش
باوکی ناو تەلەفۆنم لێ نەهاتەوە.
بەڵام من قەت نەمدەتوانی باوکی ناو
تەلەفۆن بنووسم گەر بە ئەزموونی
نووسینی کاراکتەرێکی وەك غەریب
ریکۆردا تێنەپەڕیمایە. لەوەوە من
وەك تۆرگێنێف فێر بووم کە گەمەی نووسین
هەوڵ دانێکە بۆ ئەوەی کە دوو جار دوو نەکاتە چوار،
ئەو ڕێگا ئاسانەی کە زۆربەی زۆری چیرۆکەکانی تر
دەیگرنە بەر بۆ ئەوەی بکاتە چوار، بەڵام من ڕێگا
ئاسانەکەم هەڵنەبژارد و چیرۆکێك و حیکایەتێکم
تێکەڵاو کرد و تێکەڵێکی جیاوازم لێدروست کردن کە
پێشتر کەس لەو جۆرەی نەنووسیبێت. وەك پێشتریش
لە چاوپێکەوتندا باسم کردووە کە من کاریتەی کچم
هەمیشە بە حیکایەت دەخەواند، بەجۆرێك حەزی لەو
حیکایەتانەی من بوو کە بەدەگمەن دەیهێشت کتێبی بۆ
بخوێنمەوە، چونکە لەگەڵ ئەو حیکایەتانەدا کە من بۆم
دەکرد چەند ئێوارەیەکی دەخایاند و خواخوای بوو ئێوارە
بێت و من حیکایەتەکەی بۆ تەواو بکەم، یان دەست
بکەم بە دانەیەکی تازە بۆی. بەم جۆرە دەستمان پێ
دەکرد کە ئەو هەمیشە دێڕی یەکەمی دەوت و منیش
دەبوایە لەسەر ئەو دێڕە، هەر لەوێدا و دەستاودەست
حیکایەتێك بچنم کە لەهیچ حیکایەتێکی تر نەچێ
کە ئەو تا ئێستا گوێی لێ بوو بێت، یان لە کتێبدا
هەبێت.. بۆیە ئیشەکە هەتا بڵێی زەحمەت
بوو. لەڕاستیدا وەك هەمووومان دەزانین وتنی
حیکایەت لەهەموو کلتوورەکانی دونیادا
بۆ منداڵان بۆ ئەوەیە کە منداڵەکە لەگەڵ
حیکایەتەکەدا خەو بیباتەوە، ئەم پرۆسەیە
لەهەموو سەردەمەکاندا وا بووە لای
کچەکەی من نەبێت، کاریتە لەگەڵ
حیکایەتەکەی مندا تا تەواو دەبوو
لەمن بەخەبەرتر بوو، زۆری

لەخۆی دەکرد نەخەوێ. پرسیارم دەکرد، کچەکەم
ئەوە بۆ ناخەوی؟ دەیوت بابە چۆن بخەوم، تا نەزانم
کەروێشکەکە چی لێ هات، تا نەزانم سندوقەکە
چی تیا بوو؟ کچەکە لەگەڵ خۆیدا چی هێنایەوە؟
چۆن خەوم لێ دەکەوێ؟ بۆیە منیش کە درەنگ
دەبوو بەزۆر بەشێکم تەواو دەکرد چونکە تا ئەو
کاتە چاوانی وەك دوو ئەستێرە دەبریسکانەوە و هی
ئەوە نەبوون دوو سەعاتی تریش دابخرێن. بەم
جۆرە لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا حیکایەتێکی زۆر
لەرۆحی مندا کۆبوونەوە بەبێ ئەوەی لەکاتی خۆیدا
بیاننووسمەوە. ئێستا هەندێکیانم پچڕ پچڕ بیرماوە،
کاریتەش هەندێکیان دەزانێ، دووانیانیشم لەهەردوو
چیرۆکی باوکی ناو تەلەفۆن و دیلی دەنگەکاندا
نووسیوەتەوە و بەو شێوەیە توانیم تەنها دووانیان
لەفەوتان رزگار بکەم. ئەوانی تر بەو پچڕ پچڕییە
و گرێدانەوەیان بەیەك و کردنەوەیان بە حیکایەتی
ئەوسا لەهەڵگرتنی بەردی سیزیف زەحمەتترە.
بەهەرحاڵ ساڵی ٢٠٠٧ کاتێك کاك بەختیار عەلی
ڕۆمانی غەزەلنووس و باغەکانی خەیاڵی نووسی و
خۆشبەختانە من یەکێك بووم لەو هاوڕێ کەمانەی
کە ئەم نووسەرە ئازیزە ڕۆمانەکەی پێش چاپ کردن
بۆ ناردین تا بیخوێنینەوە و ڕای خۆمانی پێ بڵێین.
بیرمە دوای هەفتەیەك من ڕۆمانەکەم خوێندەوە و
تێلم بۆ کرد و زۆر
شتمان باس کرد،
باسی ماجیدی
گوڵ سۆلاڤ
کە دەچێ بۆ نوێمیران تا حیکایەت بۆ منداڵانی
بارۆنەکان بکات، لەرۆمانەکەدا ماجیدی گوڵ سۆلاڤ
حیکایەتێك دەست پێ دەکات و ئیتر تەواوی ناکات،
لەو شوێنەدا بە کاك بەختیارم وت دەزانی زۆر جوان
و سەرنج ڕاکێش دەبوو گەر ماجیدی گوڵ سۆلاڤ
هەموو حیکایەتەکەی کە تەنها دێڕێکی دەست پێ
کردووە تەواو بکردبایە و هەمووی بگێڕایەتەوە،
وتی فیکرەیەکی جوانە، وتم تۆش وەکو من کچێکت
هەیە یەکبار حیکایەتت بۆ کردووە، وتی وایە، وتم
هەر یەکێك لەو حیکایەتانەت هەڵبژاردایە زۆر جوان
دەبوو، وتی بۆ نا، تێکەڵییەکی جوان دەبوو، منیش
یەکسەر وتم ئێ باشە من دەیکەم، وتی دەباشە
و هەردووکمان پێکەنین. ئیتر هەر ئەو ئێوارەیە
دەستم کرد بە نووسینی باوکی ناو تەلەفۆن.
هەستم کرد هەموو شتێ بۆ نووسینی ئامادەیە.
وەك سفرەیەکی پڕ و ڕاخراو بەڵام تەنها لە خەیاڵدا
حازر و بزر. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاتێکی
زۆری ویست تا تەواو بوو چونکە شەڕی گەورەی
من لەم چیرۆکەدا دۆزینەوەی خۆم بوو لە نێوان
دێڕەکاندا و هینانە دەرەوەم بوو تا چیرۆکەکە بێ
من بتوانێ هەناسەیەك بدات، بەڵام ئەمە مەحاڵ
بوو، چونکە هەستم کرد من لەزۆربەی دێڕەکاندام،
ئەوەی نووسراوە و ئەوەشی نەنووسراوە. بەتایبەتی
حیکایەتی ناو چیرۆکەکەش هی خۆم بوو کە بۆ
کچەکەم کردبوو، زیاتر وەك سیکۆتین منیان بە
هەموو ڕابردووی خۆمەوە گرێ دایەوە و بۆ ئەبەد
منیان بە چیرۆکەکەوە نووساند و ئیتر نە من لەو



بوومەوە و نە ئەو لە من. بۆیە دواجار تەسلیمی بووم و ئەوەی لەسەرم بوو نووسینەوەی بوو. بەدەرهێنانی هەندێ جاری خۆم لە هەندێ پەرەگراف. بەڵام وەك لەسەرەتادا وتم ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە من ئەم چیرۆکەم لەهەموو چیرۆکەکانی تر خۆشتر بوێت، بۆیە ناتوانم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە گەر ڕێگەم بدەن چیرۆکێك بەرم بۆ ئەو دیوی دونیا، ئەوا من بەمە ڕازی نابم، یان هیچ نابەم یان زۆرێك لە چیرۆکەکانم دەبەم. باوکی ناو تەلەفۆن، گوڵەکانی دۆزەخ، بلیتێك بۆ جەهەنەم، دیلی دەنگەکان، زێراب، نووسینەوەی دڕك، من بە بووکێکی گەورەوە و زۆری تریش لەو چیرۆکانەی خۆشمدەوێن. جا من بێ ژنی ژێر باران بۆ کوێم دەبەیت خوایە، بۆ کوێ دەرم دەکەیت؟ هەموو شوێنێك بێ ئەو جەهەنەمە، تەنانەت بەهەشتیش.

٢

هەندێ جار تێکستێك دەخوێنیتەوە و دونیایەکی تازەت بەڕوودا دەکرێتەوە. شتەکان، سەیرکردنی تۆ بۆ دونیا، پەیوەندییەکانی خۆت بە کاراکتەرەکانەوە، بە خۆتەوە سەر لەبەری دەگۆڕدرێت. گەر شانسێکی باشت هەبێ، ئەم پرۆسەیە چەند جارێك لەژیاندا ڕوو دەدات. زەمەنێك هەیە پێش ئەو تێکستە و زەمەنێکیش دوای ئەو، زەمەنی دوای ئەو هیچ شتێ وەکو خۆی لێ نایەتەوە. ئەم کارلێکردنە لە هەموو بەشەکانی دونیادا هەبووە و لە ڕەگەوە هەموو شتێکی گۆڕیوە، لەم بەشە بچووکەی دونیای ئێمەشدا هەر هەیە و کاری خۆی کردووە، تەنها هەر ئەوەیە نووسەر باسی بکات. نووسەرە گەورەکانی ڕووس وەکو دۆستۆیێفسکی و تۆلستۆی و گۆگۆڵ و چێخۆف، کاری گەورەیان کردە سەر نەك تەنها ئەدەبی ڕووسی دوای خۆیان، بەڵکو کاریان کردە سەر هەموو ئەدەبی جیهانیی و مرۆڤایەتیش بەگشتی. من ئێستا تەواو باوەڕم بەوەیە کە هەموو ئەدەبێکی جوان دەبێ بەشێك لە ڕۆحی ئەدەبی کلاسیکی ڕووسی لە ناخیدا هەڵگرتبێت تا ئەدەبێکی جوان بێت. من ئەو ڕۆحە لە نزیکەوە ژیام، هیچ میللەتێکم لە دونیادا نەبینیووە وەك ڕووس نووسەرانی خۆیان خۆش بوێ و ڕێزی بگرن. چونکە نرخیان دەزانن. دۆستۆیێفسکی لە شوێنێکدا دەڵێ، کە ئێمە هەمووومان لە پاڵتۆکەی گۆگۆڵەوە هاتووینەتە دەرێ، هێندە ئەو چیرۆکە کاری لەسەر نووسەران هەبوو. چیرۆکی پاڵتۆ ١٨٤٢. خوێنەرێکی زۆر ئێستاش لەو پارکە بەناوبانگەی سانت پترسبورگدا بە دوای لووتی پاڵەوانەکەی گۆگۆڵدا دەگەڕێن لە چیرۆکی لووت

دا. چیرۆکی لووت ١٨٣٦ هەر بە خۆشی ئەو لووتەوە چەند سەعاتێك پیاسە دەکەن، لەگەڵ ئەوەدا کە دەشزانن نایدۆزنەوە چونکە ئەو لووتە تەنها لەناو چیرۆکەکەدا کەوتووە. مارکیز لە یاداشتەکانیدا دەڵێ کە کاتێك پاڵەوانێکی وەك گریگۆر سامسای کافکا دەخوێنێتەوە (ئەم رۆمانە لە ساڵی ١٩١٢ دا دەنووسرێت و لە ١٩١٥ چاپ دەکرێت)، ئیتر هیچ شتێ وەکو خۆی لێ نایەتەوە، کاری ئەو رۆمانە لەسەر خولیو کۆرتازار، ماریۆ ڤارگاس، کارلۆس فیونتۆس و ئەلیخۆ کارپینیز و مارکیز و هەموو نووسەرانی سالانی ٦٠ ی ئەمەریکای لاتین بێ وێنە بوو. ئەو رۆمانەی کافکا کاتێك دەکرێتە ئیسپانی، کە مارکیز لەتەمەنی سەرەتای نووسینیدا دەبێت، دوای زیاتر لە بیست ساڵ و لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا مارکیز دەتوانێت ئەوەی پێی دەڵێن ریالیزمی سیحری دابمەزرێنێت، بەڵام سەرەتاکانی ئەو خەیاڵەی هەر لەو رۆمانەی کافکاوە بۆ هات وەك خۆی دەڵێ، کاتێك بینی گریگۆر سامسا شەو دەنوێ و بەیانی لەخەو هەڵدەستێت و لە ئاوێنەدا سەیری سیمای خۆی دەکات بووە بە قالۆنچەیەکی گەورە و ناشرین، گەر وا بێت لە چیرۆك و رۆماندا هەموو شتێ کاری کردەیە و هیچ شتێ مەحاڵ نییە،

بۆیە پاڵەوانەکانی مارکیز دوایی بێ زۆر لەخۆکردن دەفرن و کەسیش ناڵێ ئەوە چۆن؟ مارکیز لەم رۆمانەوە دەسەڵاتی زمانی بۆ دەرکەوت و تێگەیشت کە شەهرەزادێکی تازە لەدایك بووە بەڵام نەوەك لە ژیانی هەزار و یەك شەوەدا، بەڵکو لە ناچاری دونیایەکدا کە هەموو شتێ لەناو چووە. هەروەها مارکیز باسی کاری رۆمانی ئۆلیسیسی جیمس جۆیس دەکات کە دوای خوێندنەوەی دونیایەکی سەیری بۆ ئاشکرا دەکات کە لەخۆیدا نەبووە، وەك خۆی دەڵێ ئەو رۆمانە فێری تەکنیکی دەکات. فێری دەکات چۆن شارەزایانە زەمەنە گوێزراوەکان بەکاربێنێت و پێکهاتەی چیرۆکەکانی بینا بکات. من ساڵی ١٩٩١ هاتم بۆ سوید، تا ئەو کاتە ئەدەبم بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و رووسی دەخوێندەوە و ئێستاش زیاتر بە سویدی دەخوێنمەوە، بەڵام ئەو کاتە سالی ١٩٩٢ لە گۆڤاری وان دا کە کاك خەبات عارفی شاعیر دەریدەکرد، چیرۆکێکم خوێندەوە کە ئەوسا لەبارەی نووسینی چیرۆکەوە زۆر شتی لە مندا گۆڕی، کە ئەویش چیرۆکی «چاڵ» ی نووسەری ئێرانی قازی ریبحاوی بوو.(گۆڤاری وان، ژمارە یەك، ساڵی ١٩٩٢) کە کورێك لە جەنگی عێراق و ئێراندا باسی شەهید بوونی خۆی دەکات. من تا ئێستا بە هەندێ زمان چیرۆکی زۆرم خوێندۆتەوە، بەڵام ئەم چیرۆکە تا ئێستاش یەکێکە لەو چیرۆکە جوانانەی کە دیدی منیان بۆ نووسینی چیرۆك گۆڕی و کاری قووڵیان لێ کردم. زۆر شت لەم چیرۆکەوە فێر بووم، فێر بووم نووسەر دەتوانێ تەکنیکی جوان لە چیرۆکدا بەکاربهێنێت، هەروەها لەم چیرۆکەوە چنین فێر بووم، چۆن دەتوانم ئیقاعێك بە



گێڕانەوە بدەم، چۆن چیرۆك بە شێوەی جیاواز بینا بکەم. فێر بووم چنین و تەکنیك و کاراکتەر و زمان هەموو پێکەوە و لەیەك کاتدا کار دەکەن، نەك جیا بەجیا، فێر بووم چیرۆکێکی باش نییە لە دونیادا زمانی باش بێت و تەکنیکی تیا نەبێت، یان تەکنیکی جوان و چنین و زمانی لاواز. پاڵەوانە غەمگینە یەك چاوەکەی ئەم چیرۆکە یەکسەر کاراکتەرەکانی ئەدەبی کلاسیکی رووسیان بەبیر هێنامەوە، ئەو قوڵبوونەوە جوانە بە ناخی مرۆڤدا منیان لە هەموو شتێ زیاتر فێری نووسین کرد، ئەو یاری کردنە بە گێڕانەوە کە لەم چیرۆکەدا هەیە منی سەرسام کرد.
لە گێڕانەوەی ئەوکەسەوە کە دەکوژرێت، یەکسەر دەتباتە سەر گێڕانەوەی ئەو کەسەی دەکوژێت، جوان پێشانی دەدات چۆن هەردووکیان لەیەکتر ترساون و خواخوایان بووە یەکتر نەبینن. کەم چیرۆکم بینیووە ئاوا جوان باسی غەمی مرۆڤ بکات. لەو باوەڕەدام هەر کەسێك لەبەرەکانی شەڕ، کاتی خۆی ئەم چیرۆکەی بخوێندایەتەوە یەکسەر چەکەکەی فڕێ دەدا و قەت لەژیانیدا هەڵینەدەگرتەوە.



# باوکی ناو تەلەفۆن

ئارام کاکەی فەلاح
ستۆکهۆڵم
نۆڤێمبەری ٢٠٠٧

من باوکی ناو تەلەفۆنم ، کچێکم هەیە و ڕۆژانە بە تەلەفۆن قسە دەکەین .تەمەنی یەك ساڵان بوو کاتێ من و دایکی جیابووینەوە. ئێستا پێنج ساڵە و هەموو ئێوارانێ کاتێ بیەوێ بنوێ، دەبێ من تەلەفۆنی بۆ بکەم و حیکایەتێکی تازەی بۆ بکەم ، ماچێکی بە تەلەکاندا بۆ بنێرم و شەوباشی لێ بکەم.بەڵام زۆرجار ناگاتە شەوباشەکە ئەو وەك





فریشتەیەکی چکۆلانە بێ غەم دەنوێ
. دوکتۆر گیان ! من بۆیە هاتوومەتە
لای تۆ ، دەمەوێ منیش بخەوم، من
چوار ساڵە نەخەوتووم ، هەست دەکەم
نەخەوتووم ، ڕاستر بڵێم زۆر کەم
دەخەوم .شەوانە دوو سەعات زیاتر
ناکات، هاوڕێکانم زیاتر هانیان دام کە
دوکتۆرێکی دەروونی بدۆزمەوە و قسەی
لەگەڵدا بکەم.من داوای لێبووردن لە
تۆ دەکەم گەر بڵێم من زۆر بڕوام بەو
شتانە نییە ، من بڕوا ناکەم تۆ گرفتی
من چارەسەر بکەیت ،چونکە گرفتی من
خۆم بۆ خۆمم دروست کردووە .وەك من
خۆم چاڵێکی قووڵم هەڵکەندبێ و بە
پێی خۆم چووبێتمە ناوی، چاڵێك لە من
زیاتر کەس نەیبینێ ، هەزار هاواریش
بکەم کە تۆ چاڵەکە نەبینی چۆن دەرم
دێنی؟ با تۆ پەتێکیشت پێبێ ، بە کوێدا
شۆڕی دەکەیتەوە بۆم پێم ناڵێی ؟
من ڕەنگبێ چەند جار بێمە لات و
لەسەر ئەم کەرەویتەیە پاڵ کەوم و
چیرۆکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە ودڵم
کەمێ ئاسوودەتر بێ ، لەوانەیە بە
گێڕانەوەی قوورسایی سەر دڵم تۆزقاڵێ
فەرق کا، بەڵام من ئەو ئاگرەم تازە بە
فوو بۆ ناکوژێتەوە کە لە دەم و چاو و
سەروقژم بەربووە .ئەو شەڕەشمشێرەم
بۆ نابڕێتەوە بە ڕووت و قووتی .
دوکتۆر گیان ! پێت سەیر نەبێ ئەو تابیرانە بەکاردێنم
، من کە دەچمە سەر جێگای نووستن دەڵێی دەچم بۆ
شەڕ ،
من شەو دوای شەو هەست دەکەم ئەم شەڕەم
بۆ نابڕێتەوە، من لە سیزیف خراپترم لە جیاتی
بەردێك دوو بەردم بە کۆڵەوەیە ، بەردێکیان سزای
خوداوەندەکانە و بەردەکەی تریان سزای منە بۆ
خۆم .سوور دەشزانم بە تەشتێك عارەق کردنەوەی
شەوانەوە و بە ئاوساویی چاوانمەوە کە لە کولێرە دەچن
بە بەیانیان بەو دوو بەردەوە ناگەمە لووتکەی شاخ .
من ئەزموونی ئەم چەند ساڵەم ئەوەیان فێر کردم
کە تاقە شتێ من بتوانم بیکەم ئەوەیە کە خەو وەك
شەڕ نەبینم، بۆیە هاتوومەتە لای تۆ دەمەوێ لەگەڵ
خەودا ئاشتم بکەیتەوە . نامەوێ نووستن بکەمە
دوژمنی خۆم ، چونکە دواجار هەر من دەیدۆڕێنم ،
ئەوە منم پێویستم بەوە نەك ئەو بە من .ئەوە منم
هەموو ڕۆژەکە بە گێژی دەسووڕێمەوە و بە حەپۆلی
کار دەکەم و بە شەویش دێمەوە لای ئەو .
دوکتۆری ئازیز ! پێم بڵێ من چی بکەم؟
– تۆ با جارێ بچینەوە سەرەتا . کە لە
حیکایەتەکە دەبیتەوە و کچەکەت خەوی لێ
دەکەوێ و تۆش تەلەفۆنەکەت بە دەستەوەیە .
وەك باوکێك هەست بە چی دەکەیت ؟
بە هەناسەکانیدا دەزانم خەوتووە
، دڵم نایەت هەلاو هەلاو بکەم
تا خەبەری نەکەمەوە ، بە

ئاسوودەییەوە بۆ ماوەیەك گوێ لە هەناسەکانی
دەگرم ، لە دڵی خۆمدا دەڵێم هەلاو، هەلاو کچە
جوانەکەم هەلاو ، هەلاو .. ئەستێرەکانی ئاسمان
هەلاو .تا دایکی دێتە سەر خەتەکەو دەڵێ ..ئەوا
ئیتر ئێستا خەوی لێ کەوتووە ، سوپاس،
تاقە شتێ کە بەیانیان خەبەری دەبێتەوە و بیری
لێ دەکاتەوە لە کوێی حیکایەتەکەدا خەوی لێ
کەوتووە ، تکایە
لای خۆت بینووسە دوایی سەرم کون دەکات .
– ئەی کە تەلەفۆنەکە دادەخەیتەوە چ هەستێکت
هەیە ؟
هەست دەکەم کە کچەکەم لای منە ، گوێم
لە هەناسەکانێتی ، بەڵام نایبینم ، هەروەك
نابینایەك کە لە بەردەمی ئاوێنەیەکدا دانیشتبێ
و سووربێ لە سەر ئەوەی کە وێنەکەی خۆی لە
ئاوێنەکەی بەر دەمیدایە بەڵام ئەم نایبینێ ،
منیش هەمان ئەو هەستەم هەیە .
کچی خۆم ! هەبوو نەبوو مێرووڵەیەکی بچکۆلانە
هەبوو جوان و ئازا بوو هەروەکو تۆ ، ئەم
مێرووڵەیە ڕەنگی
پرتەقاڵی بوو . دەگێڕنەوە و دەڵێن کە گوایە
دایکی ئەم مێرووڵەیەی هەر بە منداڵی بۆ ماوەی
دوو مانگ لە ناو قۆخێکدا شاردۆتەوە ، بۆ ئەوەی
کەس ئازاری
نەدا ، دوایی
کە هاتۆتە
دەرەوە ڕەنگی
لە ڕەشەوە بووە بە نارنجی .
کچی بابە .. فریشتەکەم ! مێرووڵە چەندێ بچووکە هەزار
ئەوەندەش بە هێز و بە ئیرادەیە ، تاقە گیان لەبەرێکە
کە دەتوانێ چەندەها جار لە کێشی خۆی زیاتر هەڵگرێ و
نەشڵێ ئاخ . تۆ دەزانی بۆ ناڵێ ئاخ ؟
– چونکە مێرووڵەکە کوردی نازانێ تا بڵێ ئاخ ، وا نییە
بابە ؟
– نا کچەکەم ئەم مێرووڵەیە کوردی باش دەزانێ ،
هێندە هەیە مێرووڵە ماندووبوون نازانێ ، بۆیە منیش
حەزدەکەم تۆش وەك مێرووڵە وابیت ، ئازابی و قەت بەو
بچووکییەی خۆتەوە ، خۆت بە لاواز و بێدەسەڵات نەزانی .
– ئەی کە دەچیتە سەر جێگا بیر لە چی دەکەیتەوە ؟
بیر لە هەموو شتێك دەکەمەوە دوکتۆر ، شتی هێندە
قۆڕ قۆڕ دێن بە مێشکمدا ناتوانم کۆنترۆڵیان بکەم ، بۆ
نموونە ،کچەکەم زۆر خراپ دەخەوێ ، هەندێ جار بە پێ
لە کاتێکدا لە شیرین خەودایە لێفەکەی هەڵدەداتە سەر
دەم و چاوی خۆی ، دەترسم ڕۆژێ لە ژێر بەتانییەکەیدا
شتێکی لێ بێ .یەك جار ئەمە ڕووی داوە ، بە پەلە
فریای کەوتم، هەناسەی تووند بوو بوو ، ئێستاش دوای
دوو ساڵ ئەو دیمەنەم بیر ناچێتەوە ، دیمەنێکە لە ناو
گلێنەکانمدا خۆی حەشارداوە و هەموو شەوێ لەقەیەکی
تازە دەدا لە تەمەنم .
– ئەی دایکی ئاگای لێ نابێ ؟
با ، من هیچ گلەییەکم لە دایکی نییە ، چەندەها جار
بە شەوان وەك خۆی دەڵێ سەیری دەکات ، هەرچەندە
ئێستا وازی لەو ئەتوارە هێناوە بەتانی هەڵداتە سەر دەم
و چاوی خۆی ، بەڵام ئیتر من باسی مێشکی خۆمت بۆ






دەکەم .
جار جاریش بەتانییەکە لە خۆی لا دەدات ، هەندێ جار کە دێتە لای من بخەوێت ، تا بەیانی سەد جار دەچمە ژوورەکەی و دایدەپۆشم تا سەرمای نەبێت .بە کەمترین جوڵەی لەو دیوەوە ،من لەمدیو بە خەبەردێمەوە و دوایش بە زەحمەت خەوم لێ دەکەوێتەوە.
کچی جوان ! ئەم مێرووله پرتەقاڵییە ، هەرچەندە هەمیشە بۆنی قۆخی لێ دەهات ، بەڵام حەزی لە سێو بوو ، بە دارسێوێك فێربوو بوو هەموو ڕۆژێك پیا هەڵدەگەڕا و سێوی دەخوارد و چەند قەپاڵێکیشی دەبردەوە بۆ ماڵەوە .
ڕۆژێکیان کە چووە سەر دارسێوەکە سەیری کرد یەك سێو چییە پێوەی نەماوە ، ئەم لقی کرد و ئەو لق، لەم گەڵا بەربووەوە بۆ ئەو گەڵا ، زۆر تووڕە و بێتاقەت بوو . بیهێنە بەر چاوی خۆت بە چەند سەعاتێك بچێتە سەرەوە و بە دەست بەتاڵی ئەوەندەی تریشت پێ بچێ و بێیتە خوارەوە . برسێتی بڕستی لێ بڕی بوو . کە هاتە خوارەوە چوو بۆ ماڵی کەروێشکێکی سپی جوان کە نزیکترین ماڵ بوو لە دارسێوەکەوە و لە دەرگای دا .
_ئەی ئەو دوو سەعاتەی کە دەڵێی دەخەوم ، باش دەخەوی یان زوو زوو خەبەرت دەبێتەوە ؟
نا دوکتۆر باشی چی ، هەموو دە خولەکێك خەبەرم دەبێتەوە ، لە ماوەی ئەو دوو سەعاتەدا بە دەیەها خەونی ناخۆش دەبینم ، من ڕۆژێ خەونەکانم دەمکوژن ، دوکتۆر گیان ، خەونەکانم دەمکوژن .
خەون دەبینم و لە شوێنێکی زۆر بەرزەوە دەکەومە خوارەوە ، خەون دەبینم و مۆبایلەکەم لێدەکەوێتە ئاوەوە لەو کاتەدا کە لەگەڵ کچەکەمدا قسە دەکەم و ئەو دەڵێ بابە قسەیەکی زۆر گرنگت پێ دەڵێم ، فریا ناکەوم بزانم چی دەڵێ ، لەژێر ئاوەکەوە دەنگەکان وەك چەند پارچە سەهۆڵێکی بچووك دەتوێنەوە . خەونێکی تر دوو ساڵە لێم نابێتەوە و هەموو شەوێ دووبارە دەبێتەوە ، دەمەوێ بچمەوە بۆ ماڵەوە و ماڵەوەم بۆ نادۆزرێتەوە ، من لە خەونەکانمدا زۆر بێ ماڵم ، زۆر بێ حاڵم ، زۆر بێ هاوڕێم ، دەچمەوە شاری منداڵیم و کەس ناناسمەوە و کەس نامناسێتەوە. نیوەی شاریش لە نیوەکەی تر دەبات و نیوەکەی تریش جنێودەدات ، بە کۆڵانی خۆماندا ڕەت دەبم و هەموو دەمووچاوەکان تازەن ، دەمەوێ بە کلیلەکەم دەرگای کۆڵان بکەمەوە و کلیلم پێ نییە ، زەنگ لێدەدەم و کەس دەرگام لێ ناکاتەوە ،زەنگ لێ دەدەم و کارەباش نییە کارەبا دەمگرێ .
کە مێرووڵەکە لە دەرگای دا ، کەروێشکەکە دەرگاکەی لێ کردەوە و وتی

کێیە ؟ ئەوە منم ، مێروولە نارنجییەکەی هاوڕێت ،
دەتوانم بێمە ژوورەوە بۆ لات ؟
کە چووە ژوورەوە بە سەدەها سێوی بینی یەکسەر
تێگەیشت کە کەروێشکەکە هەموو سێوەکانی دارەکەی
لێ کردۆتەوە ، بردوویەتی بۆ خۆی ، زۆری پێ ناخۆش
بوو ، وتی ..کەروێشکی ئازیز ! دەزانم تۆ دڵت پاکە بەڵام
تۆ هەموو سێوەکانت بۆ خۆت بردووە ، تۆ بەس بیرت
لە خۆت کردۆتەوە ، وا نابێ کوڕی باش ، ئەوە دارسێوی
هەمووومانە ماڵت ئاوا بێ ،
– ئاخر من بیرم لە زستان کردەوە مێروولەی
بۆن خۆش ، ئەی کە زستان هات من چی
بکەم ؟ تۆ مێروولەی لە من ئازاتری ، خواردنی
خۆت لە بن عەرزا دەردێنی ، بەڵام من چ؟
کەروێشکەکە بە چاوچنۆك و مێروولەکەش لە ناو
هاوڕێکانیاندا بە زیرەکی ناسرا بوون ، وتی باشە من
برسیمە ، ئەی کەروشکی جوان ، چووم سێو بخۆم
و هیچی لێ نەبوو ، ماڵەکەی تۆش پڕە لە سێو ، تۆ
دەتوانی سێوێك بە من بدەی کاتێك دەچمە دەرەوە ،
– بێگومان سێوێکت دەدەمێ بیبەیت لە گەڵ خۆتدا
– دە باشە من ئێستا دەڕۆم، سێوێکی وەرگرت و
سەیرێکی کەروێشکەکەی کرد و وتی .. کەروێشکی جوان،
من زۆرم برسییە، دەتوانم سێوەکەم لێرە بخۆم ؟
– هی خۆتە ، چی لێ دەکەی لێی بکە .
ئەویش هەموو
سێوەکەی خوارد،
سوپاس ، وا ئیتر
خەوتووە ، لای خۆت



بینووسەوە ، تا بیرت نەچێ ، سبەی ئێوارە بۆی
تەواو بکە ، دەنا هەزار جار پرسیارم لێ دەکات ،
ئەم کچەمان لە خۆت دەچێ ، ئا .. هەر تەواو لە
خۆت دەچێ ، حەزی لە حیکایەت و بەسەرهاتە .
دوکتۆر گیان ! من تا بەیانی هەرچی کەسێك
بە منداڵی لە من زوویر بووە دێتەوە یادم ،
هەموو ئەوانەی دڵڕەقییان بەرامبەر من نواندووە
دێنەوە بەرچاوم . ژوورەکەم لە جیاتی ئەوەی
ژووری نووستن بێ دەبێتە ژووری یادگار، ئەو
قەرەوێڵەیەی لە سەری دەنووم ، لە جیاتی
ڕاکشان و خەوێکی قووڵ تا بەیانی ، دەبێتە
شوێنی هەڵکۆڵینی یادەوەرییەکانی منداڵیی
، لە جیاتی ئەوەی خەو ئامێزم بۆ بکاتەوە ،
دوودڵییەك لە باوەشم دەگرێ کە تا بەیانی
هەزار گاز لە گلێنەی چاوانم دەگرێ .بەڵام ئیتر
هەندێ جار لەو گەرانەمدا هێندە ماندوو دەبم ،
ئاگام لە خۆم نامێنێ و وەك ببوورێمەوە خپ لێی
دەخەوم .

کچی خۆم ! مەیموونی جوان ! کە مێروولەکە
سێوەکەی خۆی خوارد ، وتی دەباشە زۆر سوپاس
وا دەڕۆم ، ئەو سێوەم بدەرێ کە پەیمانت پێدام
لەگەڵ خۆمدا بیبەم کاتێ دەڕۆم .کەروێشکەکە
وتی – ئەی نەتخوارد ؟ ئەویش وتی ئاخر تۆ
پەیمانت بە من دا کاتێ دەڕۆم سێوێك لەگەڵ
خۆمدا بەرم ، وا منیش دەڕۆم .
کەروێشکەکە ناچاربوو سێوێکی بداتێ تا



پەیمانەکەی خۆی بەرێتە سەر ، ئا ماڵەکەم ! وەك دەبینی پەیمان بردنەسەر زۆر گرنگە بۆیە مرۆڤ دەبێ ئاگای لەخۆی بێ کە پەیمان دەدا.کە سێوێکی تری پێدا مێروولەکە وتی – کەروێشکی ئازیز ! ئایا دەتوانم سێوی خۆم لێرە بخۆم ؟
–سێوی خۆتە چی لێ دەکەی لێی بکە .
ئەویش سێوەکەی خوارد و وتی دەی وا دەڕۆم ، سێوەکەی خۆم بەرێ بیبەم لەگەڵ خۆم ، – ئەی نەتخوارد ؟
– ئەی تۆ وتت چی؟ تۆ نەتوت کە دەڕۆی سێوێك لەگەڵ خۆتدا بەرە ، خۆ بێ سێو نامکەیتە دەرەوە .
گوڵی باخ ! گوڵی بابە ! بەم جۆرە مێروولەکە بە دەیەها سێوی خوارد ، تا دواجار کاتێ وتی دەتوانم سێوەکەم لێرە بخۆم ؟ کەروێشکەکە بە فێڵەکەی زانی و وتی نا لێرە مەیخۆ خۆ ماڵی باوکت نییە ، بیبەرەوە بۆ ماڵی خۆت ، خۆشم تا ماڵەوە بۆت هەڵدەگرم ، لە جیاتی سێوێکیش سیانت دەدەمێ ، دانەیەك بۆ نانی بەیانی ، دانەیەك بۆ نیوەڕۆ ، دانەیەکیش بۆ ئێوارە ، مێروولەکەش بە فرسەتی زانی و وتی – تووخوا دانەکیش بۆ خاڵخاڵۆکەکەی هاوڕێم ، سێوێکیش بۆ ئەو مێشوولەیەی کە تازە هاتۆتە گەڕەکی ئێمە ، یەك دانەش بۆ ئەو کرمە بچکۆلە باڵاکورتەی کە قەلەباچکە ڕەزاقوورسەکە دایکی خوارد ، وتی باشە منیش داوای لێبووردن دەکەم کە هەموو سێوەکانم لێکردەوە .دەکاتە چەند سێو کچەکەم ؟ شەش سێو ، ڕاست دەکەیت ، شەش سێوی وەرگرت و هەر شەشیانیشی بۆهەڵگرت تا ماڵەوە .
دوکتۆر ! کە خەبەریشم دەبێتەوە یەکسەر ڕادەکەم و سەیرێکی تەلەفۆنەکە دەکەم ، نەوەك کچەکەم تەلەفۆنی بۆ کردبێتم و ئیشی پێم بووبێ و من گوێم لێ نەبووبێ .
– بە داخەوە ، وا ئیتر کاتەکەت تەواو بوو ، ئەمانەی تۆ وتت ، من جارێکیتر گوێیان لێ دەگرمەوە ، گەر پێت خۆش بوو بەردەوامبی ، ئەوا دەتوانی چوارشەممە کاتژمێری دەی سەر لە بەیانی بێیتەوە بۆ ئێرە بۆ تەواو کردنی بەشێکی تری چیرۆکی ژیانت .
نا ، دوکتۆر ! بڕوا ناکەم بێمەوە، وەك وتم زۆر بڕوام بەو شتانە نییە ، هەرچەندە ڕێزی زۆرم بۆ ئەو پیشەیەی تۆ هەیە ، بەڵام من هەست دەکەم ئەم شەڕە شەڕی خۆمە و دەبێ من خۆم بیکەم . دەبێ من ڕۆژێ لە ڕۆژان جورئەتی ئەوەم هەبێ ئەم چیرۆکە لە پێش هەموو کەسێکدا بۆ خۆم بگێڕمەوە، دوایی بتوانم بۆ خۆمی بنووسمەوە ، تا لە کۆتاییدا بتوانم بۆ کەسێکی ئازیزی وەکو تۆی باس بکەم ، تا یارمەتیم بدەیت ، ئەوەی من ئەمڕۆ گێڕامەوە تەنها دڵۆپێك بوو لە دەریایەك کە



نەئەمسەری هەیە و نە ئەوسەر ، بەڵام تا چوار
شەممە گەر ڕام گۆڕی ئەوا دێمەوە بۆ لات و
چیرۆکەکەمت بۆ تەواو دەکەم .






**ئێمە بێ چما زیندووەکانین**
**ئەحمەد شاملوو**
**چاپکراوی غەزەلنووس**

لە مێژ ساڵە، خوێنەرانی کورد، بە ناوی ئەحمەد شاملوو شاعیری نێوداری فارس، ئاشنان. ئەمێستا ئەم ئاشناییيە پەرەی بە خۆی داوە و بژاردەیەک لە کۆی شیعرەکانی شاعیر لەبەر دەستدایە.

ئەم دیوانە دوو بەرگییە، بژاردەی کۆی دەفتەرە شیعرییەکانی ئەحمەد شاملووە و بەڕۆژ ئاکرەیی بەکوردی کردووە. وەرگێڕ خۆی، هاوڕێی شاملوو بووە و وەرگێڕانی شیعرەکانی ئەوی، نزیکەی بیستوپێنج ساڵ لەمەوبەر دەست پێکردووە. لە هێنان و بردنیان، پێداچوونەوە و ڕیتم و وشە لێگۆڕینیان هیچ پەلەی نەبووە و هێدی هێدی کاروباری وەرگێڕانی ئەم دیوانەی بە ئەنجام گەیاندووە.

هەروەتر، ئێمە بێ چما زیندووەکانین، هەڵگری گفتوگۆیەکی چڕوپڕی ئەحمەد شاملوو و ئاکرەیییە، کە تێیدا چەند باسێکی گرینگ، لە بارەی ئەدەبیات و شیعر و نووسەرانی تاراوگە و شیعری نیما یووشیج و چەند باسێکی دیکەوە، دەورووژێنن. هەروەها دیوانەکە، چەند نامەیەکی شاملووی تێدایە، کە بۆ وەرگێڕی ناردوون و یەکەمجارە بڵاو دەبنەوە.

ناونیشانی ئەم دیوانە، لە دێڕەشیعرە جوان و ڕیتمدارەکانی شاملووە، کە فارسییەکەی برتییە لە: ما بی چرا زندگانیم.

جێی ئاماژەیە، ئایدا هاوسەری ئەحمەد شاملوو، لە نامەیەکی کورتی خۆیدا، بۆ بەڕۆژ ئاکرەیی، بە بۆنەی دیوانی ئێمە بێ چما زیندووەکانین، نووسیویەتی: لەمەڕ شیعرە وەرگێڕدراوەکانی شاملوو، لە لایەن تۆوە، بە دڵێکی سەرڕێژ لە میهرەوە، دەستەکانت ماچ دەکەم و ڕێز لە زەحمەتە پر لە نرخەکانت دەگرم.

چاپی ئەم کارە شایانەی بەڕۆژ ئاکرەیی، دەبێتە نوێترین دەقی وەرگێڕدراوی شیعری ئەحمەد شاملوو، کە ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، بڵاوی کردۆتەوە.

# چاڵ

نووسینی: قاضی ربیحاوی
و. لە فارسییەوە: ناسر سینا و بەرۆژ ئاکرەیی

بۆچی کەس نازانێ من شەهید کراوم! لە حاڵێکدا کە شەهیدکرام چوومەتە لای خوا دەچمەلای.
ئێستاش هەر زستانە، زستانە و باران، بەڵام ئەو ڕۆژە باران نەباری، سێ ڕۆژ بوو پەیتا پەیتا دەباری، ڕۆژی چوارەم کردی بە ساو، ئێستا دوو مانگی بەسەردا تێپەڕیووە. ئێوارە بوو، لەنێو سەنگەردا دانیشتبووم، هەر لەوێ منی کوشت، لە سووچی سەنگەردا، خەریك بووم جگەرەم دەکێشا، دوژمن زۆرمان لێ دووربوو، نازانم کتوپڕ لە کوێوە هات. غافڵگیری کردم. کاتێ دیتم نسبیەك بەسەر سەنگەرەکەدا کشا، پێم وابوو خەریکە هەتاو لە پشت پەردەیەکی هەورا تیدەپەڕێ. لە پاشان چەند دەنکە زیخێك کەوتنە خوارێ.





کەسێك لەو سەرەوە ڕاوەستا
بوو، دەمزانی ترس دایگرتم.
هێندە ترسنۆکیش نیم. هێدی
هێدی سەرم هەڵبڕی. خۆی بوو.
لوولەی تفەنگەکەی تێکردم،
دەبوایە دەستەکانم لەسەر سەرم
دابنایە، یەکەمجار دەستی ڕاستم
بەرزبۆوە، پاشان دەستی چەپم
بە ئەسپایی هەڵبڕی. جگەرەکە
لەنێو ئەنگوستەکانمدا بەربۆوە،
کەوتتەخوارێ و دەرفەتی پێنەدام
تەق تەق.
ئاوابوو کە شەهیدکرام، دوایی پێیان
وابوو ونبووم، خۆم شرتوگوم کردووە،
ئێستاش هەروا بیر دەکەنەوە،
هەموویان هەم باوکم هەم دایکم
هەم «زەری».
زەری! کاتێ بە خۆڵ دایدەپۆشیم
بیرم لە تۆ دەکردەوە، هەر کە مشتێ
خاکی بەسەردا کردم، خوێنم دامرکا،
خاك و خۆڵ تێکەڵی خوێن بوون
و خوێنەکەیان داپۆشی و ڕەنگی
جلەکەی منیش هەر لە ڕەنگی خۆڵ
بوو.
چاوم بڕیبووە ئاسمان، ئەو لەوێ
بوو، وەك دێوەزمەیەك لەو سەرەوە
ڕاوەستابوو، وەك ئەو زەلامانەی دێتە
خەونە سامناکەکانەوە، پۆستاڵەکانی قوڕاوی بوون و
خۆرەتاو لە پشت سەری ئاوا دەبوو.
لە پێشدا سەر و سنگی داپۆشیم، دوایی خۆڵی بەسەر
پێیەکانمدا کرد. تاقە چاوەکەی تێبڕیم. چاوێك لە لای چەپ
و چاڵێکی قووڵی کرمن لە لای ڕاستی. پێمەڕەکەی بەرز
کردەوە و خۆڵی بەسەر دەموچاومدا کرد، ئیتر هیچم نەدی
جگە لە تاریکی.
با دەیهاژاند.
لەگەڵ خۆم بە تەینا مامەوە و کەسێ نەهات ناوم لە
لیستەی شەهیداندا بنووسێ، ئەگەر هاتبا...؟ ئەو دەم
لە گەڕەك حجلەیان* بۆ دەبەستم. بە ئاوێنە و مۆمی
داگیرساوەوە، وێنەکەیان لەو سەرە هەڵدەواسیم، وێنەی
لا ڕوومەتم، ساغ و سەلیم. ئینجا تۆ دەهاتی. بە نێوان
حەشیمەتی ڕێبواراندا، پاشان ڕادەوەستای و وەك ئەو ڕۆژە
کە بۆ هەیاس گریای بۆ منیش دەگریای..
چارشێوە ڕەشەکەت نەختێ لادەدرا و تێت دەڕوانین و
چاوەکانت سوور هەڵدەگەڕان و تنۆکە فرمێسکێك لە سیلەی
چاوت دەڕژا و خلۆر دەبۆوە، تاقە تنۆکێك بەس بوو. بەسە.
سەد مخابن دەری! لە زەردەپەڕی ئەو زستانەدا
با تێك دەئالا و ئەوەی گۆڕەکەمی پڕکردبۆوە
ڕۆیشت و لەنێو با-دا ونبوو... دەنا تۆ دەتزانی
کەمن ئیتر هەر ئەو قاسمە نیم کە جاران
دەتناسیم، هەر ئەو کوڕە پوورەی تۆ، کە بەردەستی
دووکانداران بوو، تۆپە قوماشەکان چەند
قورس بوون، شانی پیاو ژانی دەکرد،
دادەخزا، پێپلکەکان چەند پێچاوپێچ
بوون.

«پەل ببزێوە!»
«بەسەر چاو ئەمیرخان!»
دالآنە باریك و شێدارەکان، بنمیچە داتەپیوەکان، ئەوەش نهۆمی سێیە، بەس نهۆمێکی تر ماوە.
«هەتیو خێراتر!»
«هە هە هە»
ژووره بچووك و تاریکەکان لەم بەرەوبەری دالآنەکەدا ڕیزیان بەستووە و ئەوەی بەرامبەریش ئاودەستخانەیە.
«زووکە دەی!».
بۆنی پیسایی لە دالآنەکەدا گەڕاوە، لە بەری بەیانییەوە تا ئێوارە بۆنی پیساییت هەڵدەمژی قاسم!
«ڕاکە!»
بەڵام هیچت نەدەگوت تەنانەت ئەو ڕۆژەش هیچت نەگوت، بەس گوتت نەخێر، لە بیرت ماوە کوڕە! ئەو ڕۆژەی کە حوسێن- بەردەستی برایم ئاغا- گوتی وا باشە هەواکێشێك دابنێین. حوسێنی بەستەزمان، تازە هاتبوو.
دوایی چوو سەری بە هەموو کارگەیەکدا کرد و ، ویستی پارەیان لێوەرگرێ بۆ هەواکێش، لە پێش هەمووان‌دا کابرا تورکەکە لێی ڕاست بووە.
گوتی: «کوا؟ بۆنی پیسایی چی!؟»
چەند هەناسەی قووڵی هەڵکێشا و سەری ڕاوەشاند.
«کوا!؟»
ئەوسا برایم ئاغا و «یوسف» یش خۆش خۆش هەناسەیان هەڵکێشا.
«بۆنی پیسایی؟ ...نا!».
هەموو گوتیان ئەوە بۆنی پیسایی نییە، بۆنی



شتێکی ترە. نا ئەوە نییە.
حوسێن سەیری تۆی کرد:
«قاسم...»
«نا، بۆنێکی ترە».
حوسێن بە خۆدا شکاوە، گوتی: «ئەدی، هەو نییە، بێمێشك هەو نییە». ئینجا پێکەنی.
«بۆنی پیسایی!؟»
دوایی شتێکی گوت کە من تێنەگەیشتم، ئەوانی تر دایانە قاقای پێکەنین، تۆش پێکەنیت، لەگەڵ ئەوان، لەگەڵ حوسێن.
«خێراکە دەی!»
بەڵام ئێستا ئیتر هەموو شتێك تەواو بووە، دەفتەری کوێرەوەرییەکان دوایین پەڕەی هەڵداوەتەوە و تەواو.
سکالآیەك نەماوە، هەرچەند کە هەرگیزا و هەرگیزیش نەبووە. لە هیچ کەس، تەنانەت لەو کەسەی کە بە ڕواڵەت باوکم بوو. تۆ خۆت بدوێ بابە! هیچ کات قسەم لە قسەی تۆدا کردووە؟ هەمیشە هەر وا کراوە کە تۆ حەزت لێ بووە. تۆ تازە لەگەڵ دایکم زەماوەندت کردبوو، من پێم نەدەگووتی بابە. تۆش لەوە دڵمەند بووی، زۆرت پێدەگوتم کەوا بڵێم.
دایکیشم هەر ئەمەی لێدەویستم، بەڵام من زمانم نەدەگەڕا و دەمزانی کە باوکم لە زینداندا مردووە. هەر پێمدەگوتی «مەشەدی سمایل». تا ئەو رۆژە ئەتۆ «مەشەدی سمایل» نەبووی و باوکم بووی. لە بیرتە؟ کەس لە ماڵدا



نەبوو، تەنیا تۆ بووی، ئێوارە بوو، من تازە هاتبوومەوە.
باران لێی کردبۆوە، تۆ لە حەوشە بووی و سۆبەکەت چاك دەکردەوە، سڵاوم کرد و ویستم بچمە ژووری کە تۆ بانگت کرد بێنە!
چووم، پێپلیکانەکان تەڕبوون، پێنج پێپلیکەی بڵند و باریك. گڵۆپەکەم پێکرد، تیشکی کزبوو، ژێرخانەکە بۆنێکی پیسی لێدەهات. وەك هەمیشە، بۆنی شتێکی مردووە، خەریك بووم لە بەرمیلەکە نەوت تێکەم، شێرەکەم کردەوە. چاوەڕوان مام، لەناکاو هەستم کرد کەسێك لە پشت سەرم ڕاوەستاوە. گەڕامەوە. تۆ بووی، شوولێکی تەڕت لە دەستدابوو.
لێت پرسیم: «من کێم؟».
پاشەو پاش کشامەوە پرسیارەکەت دووپاتکردەوە، پرسیارێکی سەیر بوو، پشتم لە دیوارەکە دەخشاند و دەکشامەوە. وامزانی هەر بە ڕاستی دەتەوێ بزانی کێی.
گوتم: «مەشەدی سمایل».
دارەکەت بەرزکردەوە و توند لە پشتت کوتام، بۆ ماوەیەك گڵۆپەکە لەبەرچاوم کەوتە نێو تەمومژەوە. ئەوەم بە تاقە چاوەکەم بینی، چەمامەوە، چاکەتەکەم بە دیوارەکەدا خشا، نووزەم لێنەدەهات، تۆش هەر لە لاقت دەدام.
«من باوکتم، حاڵی بووی؟ من باوکی تۆم...»
بەڵام نەبووی
دەتگوڕاند: «تێگەیشتی؟»
تیگەیشتم، تێدەگەیشتم وە ژانی دارەکە هەمووڕەگەکانمی دەگەست، کوڵی نێو گەرووم تەقی و بەو جۆرە بووی بە باوکم. شوێنی دارەکەت لاقمی ڕەش و شین هەڵگەڕاندبوو. بەڵام من بە کەسم نیشان نەدا، لەو جۆرە کەسانە نەبوون ئینسانێکی باش بووم، زەری! ئەمیرخان زۆرم لێڕازی بوو. تۆش ئەو سەردەمە لە من ڕازی بووی، ئەو سەردەمەی مناڵ بووین و هەموو هەینییەك لەگەڵ دایکم دەهاتینە ماڵتان.
هەینییەکان بۆ من جەژن بوون. ئەودەم هێشتا چاوەکانم ساغ بوون و باوکم نەمردبوو، من بنێشتم بۆ تۆ دێنا، تەمەنمان چەندبوو؟ تۆ دەچوویە قوتابخانە و منیش لای باوکم کارم دەکرد. قوڕکێشی و ئەو جۆرە کارانەم دەکرد، بەڵام هەینییەکان هی خۆمان بوون. تۆ حەزت لە بنێشت جاوین بوو، چەق چەق، منیش کاتێ تۆ دەت جاوی گەز گەز باڵآمدەکرد.

ها! ئەو سەوزەیان بجوا!
هەموو هەینییەك كە بنێشتێكی ترم بۆ دەهێنای بە ڕەنگێكی تازەوە. هەتا ماڵەكەی ئێوە مەودا زۆربوو، حەزمدەكرد هەموو ڕۆژێ لەلای تۆبم و هەرچی هەمە بیدەمە تۆ. زنجیرە حەوت ڕەنگە نایلۆنییەكەت لە بیرە؟ زۆرم خۆشدەویست.
سێ حەوتەی خایاند تا تەواو بوو، بە ڕۆژ نەدەكرا بیچنی، ڕۆژانە هەر كاربوو، قوڕبوو، شەكەتی بوو.
«خێراكە كوڕە!»
باوك لەو سەرەوە بوو، قوڕی بۆ وەستا دەبرد و تۆش بە دوای ئەودا بە تەشتێكی چكۆڵەوە پێپلیكەكان هێشتا دانەمەزرابوون. لووس بوون و تۆ دەتویست سەركەوی و هەر نەتدەتوانی، بۆنی گڵ كاتێ ئاوی پێدا دەپرژێنن چەند خۆشە: فش ش.........
شەوانە بە دەرزی و بەن و نایلۆن دەتچنی، دوایی لە ڕۆژێكی هەینیدا بردت بۆ زەوی. چەندە درێژ و جوان ببوو. كاتێ وەریگرت چەندە شاگەشكەبوو. چاوێكی بەملاولایدا پێداخشاند. لە پاشان كەمێكی لە دەست ئاڵاند و بە تۆی گوت بگەڕێوە. گەڕایەوە. تۆ پشتت لەو بوو، ڕووت بە دیوار، دەنكە خوێیەكان بە دیوارەكەوە دیاربوون. ورد ورد. هەورەكە فرمێسكی مناڵ، ئینجا بە بەری دەست لە شانی كوتای: «دەی یاڵڵا» بۆ وای كرد؟ گاڵتە بوو. گەمەی دەكرد. یانی تۆ ئەسپی و زەوی كچێكی سواركارە. بەڵام ئەسپەكە ئێشی زۆر پێگەیشت. توندی لێدا. تۆش پێكەنیت. هۆ كچە سوارەكە! ئەو ڕۆژە پشتی ئەسپەكەت ئێشا و برك و ژانەكەی بۆ هەتا هەتایە مایەوە. هەتا ئەو سالانەی مەودا كەوتە نێوانمان.

ئەو سەردەمە سكت پێم دەسووتا، چاوەكانم تنۆك تنۆك ئاویان لێدەرژا و باوكم لە زیندان بوو، تۆ لات وابوو بۆ باوكم دەگریم، بەڵام خۆ من نەدەگریام. تەنیا ئاو بوو كە چۆڕە چۆڕە لێی دەهات و چاوەكانمی دەبرژاندەوە، شەش مانگی ڕەبەق هەر ئاوی سوێر، تا ئەو كاتەی دایكم بردمی بۆ نەخۆشخانە. دیسانیش هەر زستان بوو. دوو حەوتە لەوێ كەوتم. لەنێو ئەو كەسانەدا كە حاڵ و ڕۆژیان وەك من وابوو، ئەوانیش لە جێگەی چاو، هەر مشتێ لۆكە و كوتاڵی سپییان هەبوو. ئەو ڕۆژەی هاتمە دەرێ، چاڵێكی قووڵ و كرمێم هەبوو، كە تۆ لێی دەترسای و رووت لێوەردەگێڕا، ئیتر من نەهاتمەوە ماڵی ئێوە، تەمەنم پانزە ساڵ بوو، تۆ هەقت بوو چاڵەكە زاری كردبۆوە و دڵی ئینسانی لە خێڵەوە دێنا.
من هەموو ڕۆژێ چەند سەعاتێك دادەنیشتم و لە ئاوێنەدا چاوم تێدەبڕی. دوایی بۆ م دەركەوت كە ئەو چاڵە برینە هەر هەیە و هەمیشە دەبێ و هیچ كارێكی لەگەڵ ناكرێن تەنانەت بە دوعاكانی دایكیشم، بێ ئاكام بوو دایە! خوا چالوی درۆزنان كوێر دەكا و من درۆم پێگوتبووی.
نەمدەتوانی ڕاستییەكەت پێبڵێم، تۆ چەند ساویلكەبووی كە بڕوات پێكردم، سینەما هەتا ئەو كاتەی شەو؟ تۆ پرسیارت كرد.





بەڵام ئێمە بە درۆ گوتمان هەر لە دەرگابووە و خەوت لێنەکەوتووە. دەزانی باسی چ سەردەمێك دەکەم؟

ئەو ڕۆژانە چەندە سەخت بوون، ئەو کاتەی باوکم لەسەر قەرچێوەی «داربەست» هەڵدێرابوو و لاقەکانی عەیبداربووبوون و ئیتر نەدەچووە سەرکار، دەبێ چاکت لەبیرمابێ، ڕەنگە تۆ هەر چاوت لە دەرگا بووبێ کە بێینەوە، بەڵام ئێمە ئەو کات لەسەر دیوارێکی باریك ڕاوەستابووین.

گوتم: «دەترسێم!».

گوتی: «ترسی پێناوێ!».

ئەوسا خێرا چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا.

گوتی «تۆ هەر ڕادیۆکە هەڵگرە!».

پەنجەرەکە زۆر بچووك بوو، نەیدەتوانی تێوەی بچێ، دەلاقە بوو.

گوتم: «دەترسێم!».

درەنگ ببوو، تا سینگم تێوەی چووبووم.

- گوتی: هیچ کەس لەماڵ نییە رۆشتوون و من دەزانم.

هیچ کەس لە ژوورێدا نەبوو، ژوورەکە تاریکبوو و لە دەرەوە سووکە تیشکێك، وەك تەمی سەر لە بەیانان لە هەوادا بوو. سەر و قژی ئاڵۆزی باوکم لە پشت دەلاقەکەوە دیاربوو، هەر کە چاوم لێهەڵدەگرت ئیتر هەستم بە نەرمایی مافوورەکەی ژێر پێم نەدەکرد.

گوتی: «بڕۆ».

کوڵێکی قورس لەنێو گەروومدا پەنگی خواردبۆوە.

گوتی: «بڕۆدەی!».

نیگاکەی پاڵی پێوەنام، سەرم وەرچەرخاند و سپێتی پلاکی گڵۆپەکەم بینی، بە پەلە هەڵمکرد، باوك بە دەنگێکی بۆڕ و نێوچەوانێکی گرژەوە گوتی : «بیکوژێنەرەوە».

ڕووناکییەکی ترسهێنەربوون، کوژاندمەوە.

«هەر لەسەر مێزەکەیە».

وەك کوێرەکان هەنگاوم نا، لەسەر مێزەکە بوو.

لەوە دەچوو باوك، ماڵەکە بناسێ، ڕادیۆکە گەورە و قورس بوو، هەڵمگرت، دەتگوت هیچم لە دەستدا نییە و لە باتی ئەو، بارێکی قورستر لە تەشتێك گڵ، گەلێ قورستر، لەسەر شانەکانم بوو، وەڕێکەوتم، بە هێواشی، چاوەکانی باوك، وەك

چاوی پشیلەیان لێهاتبوو، چاوی لە ڕادیۆکەبوو.
«ڕاکە!».
قەت تا ئێستا لەنێو قیرەتاودا هەنگاوت ناوە!
کاتێ لەو چاڵە لەو هۆڵە پڕ لە تاریکییە
تیدەپەڕیم و دەهاتمە دەرێ، تەقەیەکت هات و
سەرم وە دەلاقەکە کەوت.
نەکەوتم.
«چ بوو؟».
«هیچ»
دوایی بە برینێك لەسەر تەوێڵمەوە هاتمەوە
ماڵێ، بەڵام تۆ نەتدی دایە! چاوەکانت پڕبوون
لە وەنەوز، کەچی من لەو حاڵەدا درۆم پێگوتی،
ڕۆژی دواییش هەر درۆم لەگەڵ کردی.
«کەوتمە عەرزی و سەرم وە قاناوێك کەوت».
ئاوابوو.
«لەلای هیچ کەس باسی نەکەی کوڕە»
«هەڵێ!»
ئەمە چارەنووسی تۆ بوو کوڕە، چارەنووسی تۆ،
ئێستا کە تەنیای و لەژێر خەروارێك خاك و خۆڵدا
ڕاکشاوی، شوورەیی لە خۆت بکە، لە هەموو
کەس لە زەری، لە باوکت، لەوی تر، لە دایکت،
ئەمیرخان، لە هەموو خەڵکی دنیا، تەنانەت
لە هەباسیش، کە ئەو کاتەی لەگەڵ زەری
لە کووچە و
کۆڵانەکاندا
پیاسەی
دەکرد و تۆش



دوای دەکەوتی.
بەڵێ ئەمە هی چەند ساڵ لەمەوبەرە، قەیدی چییە؟ هەر
ئەم یەك دوو جارەش زۆر بوو، ئەم کارەت بۆ دەکرد؟
بۆچی وەك نسێ وەدوایان دەکەوتی؟ سەرت داخە، زۆرتر
سوپاسی بکە.
سوپاست دەکەم، ئەگەر هەباس نەبوایە تۆ ئێستا بەم
پلەیە نەدەگەیشتی، ئەگەر هەباس و حجلەکەی نەبوایەن
و زەری ئەو ڕۆژە نەهاتبایە تەنیشت حجلەکە.
تۆ هاتی زەری، بە هێواشی هاتی و ڕووبەڕووی هەباس
ڕاوەستای و چاوت تێبڕیم، من وەرچەرخام و لە کەلێن و
قوژبنی حجلەی هەباسەوە تۆم بینی کە دەگریای، هەباس
هەزار ئاوێنەی هەبوو و من لە هەمووواندا خۆم دەدیت،
بەڵام هەزار وێنەکەی من هەباسی نەدەهێنا. بەو چاوە
گەورە و قژە ساف و شانەکراوەکەیەوە، بزەی دەهاتێ و
لەمنی دەڕوانی و لە خۆمم دەڕوانی، لە هەر ئاوێنەیەکدا
بەشێکی دەموچاوم دیاربوو، لە ئاوێنە گەورەکەی ناوەندی
حجلەکەشدا برینی چاوم.
ئاخ کارێکی چەندە باشت کرد ئاوا سەیری منت کرد
هەبای! بێشك ناوی تۆیان زوو نووسی. نا؟ بەڵام چقڵیان
زۆر لە کارەکەی من خست. هەموو بیانوو بوون.
پێویستمان نییە، چەند مانگی تر وەرەوە و ئەو جۆرە
قسانە، بەڵام هیچیان نەیتوانی لە تەمای خۆم بمگێڕێتەوە،
پاڕامەوە. نازانی چیمکرد، لەم ژوورەوە بۆ ژوورەکەی تر،
سی ئیمزا، بەسەر پێپلیکانەکاندا هەر بە ڕاکردن، دواییش
ناردیانین بۆ باشوور، تۆش هەر لەوێ بووی لە بیرمە.
چ بارانێك بوو. تەمەنت مەودای نەدای وەرزی بارانەکە
ببینی.



ئێمە زستانێ لەوێ بووین، دەشت تەڕ تەڕ بوو، من تەنیا مانگێك لەوێ بووم، بگرە کەمتریش، ئیتر دوایە وام لێ بەسەرهات، ناخافڵکرام و هەر لەبەرئەوە هێشتا منیان نەدۆزیوەتەوە. دەمدۆزنەوە، تەنیا دەبێ دەرفەتیان هەبێ و لێم بگەڕێن. توخوا بۆچی ناگەڕێن؟ ناونیشانی شاری خۆمتان پێدەدەم. وەرنە بەرەی باشور. تۆپخانە گەورەکەی ئێمە لە کوێیە؟ بیدۆزنەوە، دوایی وەرنە خوارتر، سەنگەرێکی لێیە، سەنگەری زۆر لێیە. پرسیار بکەن ئەو سەنگەرەی قاسم-ی تێدابوو کامەیە، پیشانتان دەدەن. لەو سەنگەرەوە نزیکەی چارەکە سەعاتێ، ڕاستە و ڕاست وەرنە لای دوژمن. لەوێ هێڵێکی ئاسنی لێیە، هێڵە ڕاستەقینە نا. دە بیست مێتری ئاسنی درێژ، کە نە سەری هەیە و نە بن. هەروا لەم دەشتەدا بە تاك و تەنیایی، بەرەڵایە، پێش ئەو کاتە تەنانەت لە خەویشدا، هێڵێکی وەهام نەدیبوو، پێم وابوو دوژمن دەبێ هەر لەم دەوروبەرە بێ. با دەیهاژاند و دەشتێکی ڕووتەن ڕاخرابوو. ئیتر هەتا دوور دەست هیچ شتێك بەدی نەدەکرا. دەنگی تەقە بۆ چەند ساتێك لە هیچ لاوە نەدەهات. سەیر بوو، من لە تەنیشت هێڵەکە ڕاوەستابووم. دوایی هاتمەوە و لە حاڵێکدا تفەنگەکەم لە باوەش گرتبوو بەلەز هەڵاتم. کتوپڕ دیتو لە سەرووی سەنگەرێکم قیت ڕاوەستاوم لاقەکانتم لێککردۆتەوە. ئەو لە سوچی سەنگەرەکەدا خەریکی جگەرەکێشان بوو، لوولەی تفەنگەکەم تێکرد، سەری هەڵبڕی، مرۆڤێکی سەیر بوو. خۆی گرمۆڵە کرد. ترسابوو، کاتێ دەستەکانی بەرزکردەوە جگەرەکە لەناو ئەنگوستەکانی کەوتە خوارەوە. بە تاقە چاوەکەی لە منی ڕوانی. چاوەکەی تر خۆ چاو نەبوو. چاڵێکی برینداری کرمێ بوو. تێڕوانینی چاوە ساغەکەی جۆرێك بوو، زۆر خراپ سەیری دەکردم. منیش دەرفەتم پێنەدا و پەنجەم لە پەلەپیتکەکە توند کرد: تەق تەق تەق.

تاران- ١٣٦١ی هەتاوی ١٩٨٢

* جۆرە کوتەلێکە، بۆ شەهید و جوانەمەرگی دروست دەکەن، بریتییە لە تاقیچەیەکی ڕەشپۆش کە بە دەیەها لەتە ئاوێنە و مۆم و گڵۆپی داگیرساو بە وێنەی شەهید و جوانەمەرگەکە دەیرازێننەوە.

## سوارچاکێکی نەبوو
## ئیتالۆ کالڤینۆ
## چاپکراوی غەزەلنووس

خوێنەرانی ئەدەبیات پێشتر ئیتالۆ کالڤینۆیان لە ڕێی «بارۆنی سەر دارەکان»ـەوە ناسیوە. کالڤینۆ سێیینەیەکی هەیە، کە بریتییە لە ڕۆمانەکانی، «ڤیسکۆنتی لەتبوو» و «بارۆنی سەر دارەکان» و ئەوی دیکەیان ئەم ڕۆمانەی بەر دەستە؛ «سوارچاکێکی نەبوو.»
لەم ڕۆمانەدا: سەردەم چاخەکانی ناوەندە، وردتر؛ جەنگی خاچپەرستانە و شارلمانی سەرکردەی لەشکرەکەیە.
برادمانت لە هەمان کاتدا خوشکێکی ئایینییە و خەریکی نووسینەوەی ئەم حەکایەتەیە، لە هەمان کاتیشدا، ڕۆڵێک لەنێو لەشکردا دەبینێت.
سەرنجڕاکێشترین شت ئەوەیە؛ سوارچاکێک هەیە، کە نییە، واتە تەنیا قەپێلغی زرییەکەی دەبینین، بەڵام ئامادەیییەکی بەرچاوی لەناو لەشکردا هەیە، بەرامبەریشی، گوردوولوو، دواجار دەبێتە مەیتەری ئەم سوارچاکە، بەڵام گومان لە بوونی خۆی دەکات.

لە ڕۆمانی سوارچاکێکی نەبوودا، چەند چیرۆکێک قوت دەبنەوە: گەڕان بە دوای پاکیزەیی شازادەیەکدا، چیرۆکی تۆڵەسەندەوە و چیرۆکی خۆشەویستیش، کە یەک لە کۆڵەکەکانی ئەم ڕۆمانەیە.
سوارچاکێکی نەبوو، لە زمانی فەرەنسییەوە، لە لایەن ئەحمەدی مەلاوە بە کوردی کراوە. ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، بڵاوی کردۆتەوە.





Books

نامەکانی تۆ
لەژێر
دۆشەکەکەمدا
دادەنێم

یاداشتگەلێکی
پڕ لە
نهێنی



# نامەکانی تۆ لەژێر دۆشەکەکەمدا دادەنێم

**ئامادەکردنی: سورمە**

یەکێك لەوکتێبە سەرنجراکێشانەی لە کۆتای ساڵی ٢٠١٢ دا لە لایەن چاپخانەی سویدی سالیکۆن چاپ و بڵاوکرایەوە کتێبی نامە گۆڕینەوەی نوسەری ناوداری سویدی ئەستريد ليندگرێن بوو لەگەڵ سارا شواردت بە ناوی نامەکانی تۆ لەژێر دۆشەکەمدا دادەنێم.



ئەم کتیبە لە ٢٠٨ لاپەرە
پێکهاتووە و دەکرێت وەك کتێبێکی
بیۆگرافی هەردوو نوسەر ناوزەد
بکرێت.
کتێبەکە بە یەکەم نامەی سارا کە
ئەو کات تەمەنی تەنیا ١٢ ساڵ
بووە وەك یەکێك لەو منداڵانەی
لەو سەردەمەدا زۆر سەرسامبوون
بە چیرۆکەکانی ئێمیل و پیپی
گۆرەوی درێژ دەستپێدەکات.
سەرەتاکانی نامە گۆڕینەوەی نێوان
ئەم دوخانمە کە نزیکەی ٥٠ ساڵ
جیاوازی تەمەنیانە لە سەرەتای
ساڵی ١٩٧٠ دەستپیدەکات و تا
مردنی ئەسترید لە ساڵی ٢٠٠٢ دا
بەردەوام دەبێت.
زۆربەی نامەکان ئاڵوگۆڕکردنی
تێڕوانین و بیروران دەربارەی ژیان
و عەشق و زەحمەتی زیندەگیکردن.
ئەم نامانە دیوێکی تری ئەستریدی
نوسەرمان پێئاشنا دەکات، دیوی
سادەی قسەکردن و گوێگرتن و
دیالۆگکردن لەگەڵ خوێنەرێکی
خۆیدا کە منداڵێکی تەمەن دوانزە
ساڵانە، لەوەش گرنگتر گوێگرتنە
لە گەنجێك لە سەخترین و
بریندارترین ڕۆژانی تەمەنیدا کە
سارا یە.
سارا ی تەمەن ١٢ ساڵ لە ساڵی ١٩٧١ دا یەکەم نامەی خۆی بۆ
ئەسترید دەنوسێت و باسی کێشەی هەرزەی و ئەوە دەکات کە چەند
سەختە گەورەبوون. ئەم نامانە هەموویان لە ئەرشیفی
تایبەتی ئەستریدا هەڵگیراون و پارێزراون.
سۆزیشی پێداوە کە ئەم نامانە هەرگیز
بڵاونەکرێنەوە چونکە باسی و خواسی
ژیانی تایبەتی دەگێڕێتەوە.
ئەسترید لە یەکێك لە نامەکانیدا پرسیاری
ئەوە لە سارا دەکات کە ئایا دەتوانێت
هەموو شتێك بنووسێت بۆ سارا یاخود
کەسی تر هەیە ئەم نامانە دەبینێت. لە
وەڵامدا سارا دەڵێت: «نامەکانی تۆ لە ژێر
دۆشەکەمدا دادەنێم».



لە دوای مردنی لە ساڵی ٢٠٠٢ دا هەموو
ئەرشیفی تایبەتی لیندگرێن کە زیاتر لە
٧٥ هەزار نامە و دۆکومێنتی لەخۆگرتووە
دەگوێزێتەوە بۆکتێبخانەی شاهانە لە ستۆکهۆڵم.
لەم کتێبخانەیەدا خانمێك بە ناوی لێنا تۆرنکڤیست ئەرکی
سەرپەرشتی کردنی ئەرشیفی لیندگرێنی پێدەسپێردرێت.
لەدوای پێداچوونەوەی ئەو کۆکراوانە لێنا ئەوەی بۆ ئاشکرا
دەبێت کە کەسێك بە ناوی سارا نامەی بە بەردەوامی بۆ ئەسترید
ناردووە. هەر بەهۆی بەردەوامی نامەکانی ساراوە لێنا باوەڕدێنێ
کە بێگومان دەبێت ئەسترید وەڵامی ئەم نامانەی دابێتەوە بەڵام
بەهۆی ئەوەی ئەسترید هەرگیز هیچ یەکێك لە وەڵامی ئەو
نامانەی خۆی کۆپی نەکردووە کە بۆ خوێنەرەکانی ناردوون، لێنا

ڕاستەوخۆ هەوڵی دۆزینەوە و پەیوەندیکردن دەدات بە سارا وە.
تۆرنکڤیست دەڵێت من بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەگەڵ ئەرشیفی ئەستریددا کارم کرد، ئەو کاتەی کەوتمە سەر ساڵەکانی ٧٠ ئەوەی سەرنجراکێش بوو لام نامەکانی کەسێك بوو بە ناوی سارا کە زۆرجار دەهاتنەوە بەردەستم. سارا مانگی نامەیەکی بۆ ئەسترید نوسیوە و لە کتێبەکدا نزیکەی ٨٠ نامە بڵاوکراوەتەوە. بەهۆی ئەوەی ئەسترید هەرگیز نامەکانی خۆی کۆپی نەکردووە پێش ناردنیان، بۆیە من دەبوو سارا بدۆزمەوە تاکو وەڵامەکانی ئەستریدم دەستبکەوێت.
شوارد دواتر بڕیاری بڵاوکردنەوەی نامەکانی خۆی و ئەسترید دادات و تەنیا چەند ڕستەیەکی کەم نەبێت کە دەربارەی رای ئەوکاتەی خۆیەتی لەسەر کەسە زۆر نزیکەکانی دەوروبەری دەسرێتەوە دەنا نامەکان وەك ئۆرجیناڵەکە بڵاودەکرێنەوە تەنانەت سارا هەڵەی نوسینی خۆشی چاکنەکردۆتەوە کە لەو تەمەندا لە نوسینی نامەکانیدا کردوێتی.
لە پرسیارێکدا کە لە سارا کراوە دەربارەی ئەوەی بۆچی دەستی کردووە بە نووسین و ناردنی نامە بۆ ئەسترید؟
سارا دەڵێت: ئەوە نهێنییە، با چاوەڕێ بکەین بزانین لە داهاتوودا ئاشکرای دەکەم. ئەوەی سەرنجراکێشە سارا و ئەسترید بە درێژای ئەو کاتەی نامەیان



گۆڕیوەتەوە هەرگیز یەکتریان نەبینیوە جگە لە چەند جارێکی کەم تەلەفۆن کردن نەبێت.
لە گفتوگۆیەکدا کە داگبلادێتی سویدی کردوێتی لەگەڵ سارا دەربارەی ئەم کتێبە. لە پرسیارێکدا دەپرسن ئایا ئەوە راستە تۆ نامەکانی ئەستریدت لەژێر دۆشەکەکەتدا هەڵدەگرت؟ سارا دەڵێت: من ئەوەم بیرناکەویتەوە بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێت وابووبێت چونکە ئەسترید نهێنیهەڵگری من بوو، وە هاوکارییەکی گەورەی منی کرد لەو ساڵانەی ژیانمدا کە زۆر زەحمەت بوون.
لە درێژەی ئەو دیدارەدا لە سارا دەپرسن بەڵام ئێوە هەرگیز یەکترتان نەبینیوە؟
سارا دەڵێت: ئەوە هەرگیز خەونی من نەبووە بیبینم، لەبری ئەوە من وا بیرمدەکردەوە کە ئەگەر یەکتر ببینین رەنگە ئەوەی لە نێوانیشماندا هەیە بشێوێت. ئەوە زۆر گونجاو بوو بۆ ئێمە کە هاوڕێیەتیەکەمان لە ڕێگەی نامەوە بێت. ئێمە لە ڕێگەی ئەو وشە نوسراوانەوە بەیەکتری دەگەیشتین.
سارا دەڵێت ئەو کاتەی بۆ یەکەم جار پەیوەندیم لەگەڵ لێنا تۆرنکڤیست سەرپەرشتیاری ئەرشیفی ئەسترید کرد زیاتر ئارەزووی ئەوەم هەبوو کە ئۆرجیناڵی نامەکانی خۆمم دەستبکەوێتەوە و بیگۆڕمەوە بە کۆپێکانیان. بەڵام لەبری ئەوە لێنا پێشنیاری ئەوەی کرد لە کتێبێکدا کۆبکرێنەوە. وە من هەر ئەو کاتە ووتم کە زۆربەی نویسنەکانی خۆم سانسۆر و دەستکاری دەکرێت. بەڵام وانەبوو،

ئێستا من باوەڕم بە خۆم هێناوە کە ئەوانەی بریار دەدەن لەوەی ئەم کتێبە بەم شێوەیەبێت بەبێ دەستکاری کردن باشترە و ڕاستدەکەن.

سارا ئەڵێت:

ئاستریدی ئازیز

ئێمە کە سۆزمان بەیەکتریدا نامەکانی یەکتری نیشانی کەس نەدەین، وا ئێستا دەبێت بە کتێب. من ناوێرم بیر لە سارای ١٣ ساڵ بکەمەوە کە بەرەوە کوێ ڕێی دەکرد.

ئێستا هەر کەسێك دەتوانێت ئەم نامانە بخوێنێتەوە. هەموو ئەو نامانە تەنیا لە نێوان من و تۆدا بوون. حەزم دەکرد بزانم تۆ رات چییە لەکاتێکدا ئێستا تۆ هیچ دەرفەتی سانسۆرکردن و دەستکاریکردنیانت نییە. ئێستا ئیتر وەك ئەوەیە کە لە قوتابخانەی بایبلی لە ئۆرسا دەمانگووت «هەموو شتێك لە ڕووناکیدا دەبینرێت».

سارا بە گەنجی دەستی کردووە بە نووسین، وەك و رۆژنامەنوسێکی سەربەخۆ کای کردووە، چەند نووسینی کورت و نۆڤێلێکیشی هەیە بەڵام دوای ئەو ڕووداوانەی لە ژیانیدا ڕوودادەن واز لە نووسین دێنێت.

سارا ئێستا بەتەنیا دەژی و لە شارەوانی کار دەکات و دەڵێت ئەگەر شتێك هەبێت لێی پەشیمان بم ئەوەیە کە نووسینم بە کارێکی گرنگ نەزانی، گەر بیرم لە قسەکانی ئەستريد بکردایەتەوە و بە قسەم بکردایە ئێستا ژیانم جیاوازتر دەبوو لەوەی کە هەیە.



سەرچاوەکان:

ناوی ئۆرجیناڵی کتێبەکە:

**Dina brev lägger jag under madrassen**

http://www.svd.se/kultur/sara_schwardt_och_astrid_lindgren_.svd

http://www.libris.se/bocker/dina_brev_lagger_jag_under_madrassen.html

/http://www.sydsvenskan.se/kultur__nojen/bocker/astrid_och_jag

ar_som_astrids_brevvan_٣٠/http://www.dn.se/dnbok/dnbok_hem



# «یاداشتگەلێکی پڕلەنهێنی»

## خوێندنەوەیەك بۆ بیرەوەرییەکانی ستریندبێری

**دانا ڕەووف**

نووسەری سویدی ئاوگوست ستریندبێری( ١٨٤٩-١٩١٢) هەموو فۆرم و شێوازەکانی نووسین: رۆمان، پەخشان، شیعر، کورتە چیرۆك، شانۆنامە، ڕیپۆرتاژ، سەفەرنامە، وتار، رەخنەی هونەری و ئەدەبی تاقی کردۆتەوە، ئێجگار فرە بەرهەم بووە و بە داهێنانەکانی توانیوویەتی زمانی سوێدی و دراما و شانۆی جیهانی نوێی بکاتەوە. تا ئێستا کۆی بەرهەمەکانی لە ٧٢ بەرگداو نامەکانیشی لە ٢٢ بەرگدا چاپکراون. بەڵام یەکێك لە بەرهەمەکانی کە دوای سەد ساڵ بەسەر مردنی خۆیدا بڵاودەکرێتەوە و دەبێتە جێگای سەرنج و گفتوگۆی ناوەندە کلتوورییەکەی



سوێد، یاداشتەکانییەتی، کە گرینگترین
و شاراوەترین نهێنییە تایبەتمەندەکانی
خۆی تیا تۆمارکردووە.
ئەم ساڵ ئەم بەرهەمە بە بۆنەی
تێپەربوونی سەد ساڵ بەسەر
کۆچی دوایی ستریندبێریدا، بۆ
یەکەمجار لە سێ بەرگدا چاپ و
بڵاودەکرێتەوە: بەرگی یەکەمیان
خودی دەستنووسەکەیە، بەو شێوەیەی
کە نووسیوویەتی؛ بەهەمان قەبارە،
بەهەمان جۆری کاغەز و بە شێوەیەکی
ڕەنگاو ڕەنگ و بە دەست و خەتی
ستریندبێری خۆی سکانەرکراوە. بەرگی
دووەمییان هەمان دەستنووسە، بەڵام بە
چاپکراوی و بەرگی سێیەمیش تایبەتە
بە لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەیەکی ورد
و هەمەلایەنی یاداشتەکان.
ستریندبێری پێی وابووە، کە ئەم
یاداشتگەلە گەورەیە، لەهەمان کاتدا
خودگەرا و تایبەتمەندە، لەوانەیە
کاردانەوەیەکی خراپی بەسەر باری
دەروونی خەڵکی و ئەو کەسانەی
دەیخوێننەوە هەبێت، لە بەر ئەوە
دەبێت بسوتێنرێت و لەناو ببرێت. هەر
لەبەر ئەم هۆکارە، ستریندبێری بە
قەڵەمێکی ڕەش و بە خەتێکی گەورە
لەسەر بەرگی دەرەوەی یاداشتەکانی
نووسیویەتی (ڕۆژژمێرێکی نهێنیئامێز١٨٩٦-١٩٠٨، نابێت کەس
ببینێت؛ نابێت چاپ بکرێت، نابێت بدرێتە کتێبخانە فەرمییەکان
کە دەست خەڵك بکەوێت.) بێگومان ستریندبێری لەوە دڵنیا
بووە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم یاداشتگەلەی
هەر چاپ دەکرێت، ئەو هەرگیز حەزی
بە دونیای نهێنیئامێز و شاردنەوەی
شتگەل نەکردووە و وەك نووسەریش
کاری ئەوە بووە پەردە لە سەر
نهێنییەکانی خۆی و کەسانی تر
هەڵبماڵێت. ئەمرۆ دوای سەد ساڵ
بەسەر کۆچی دوایی ئەم نووسەرەدا،
یاداشتەکانی بۆ یەکەمجار وەکو خۆی
بڵاودەکرێنەوە.
ستریندبێری لە مانگی دووی ساڵی
١٨٩٦ دا،کە لە هوتێلی ئۆرفیلە
**Orfila** لە پاریس ژیاوە، باری دەروونی
باش نەبووە و بە قەیرانێکی دژواردا
تێپەریووە، خەریکی دروست کردنی ئاڵتون
بووە. خۆڵ، گۆگرد، ئاسن و زیو و ئامێرەکانی
بەکارهێنانی تووخمە کیمیاوییەکانی بە چەشنێك لە
ژوورەکەیدا کەڵەکە کردووە، کە جێگای خۆی نەبووەتەوەو
بیری کردۆتەوە ژوورێکی تر بۆ شتەکانی بگرێت. هەر لەم
کاتەدا بە شێوازی ڕۆژمێر دەستی کردووە بە نووسینی ئەو
ڕووداوانەی کە لە دەوروبەرییەوە روویان داوە، هاوکات لەگەڵ
هەست و سۆزی خۆی، شتە سەیر و سەمەرەکان، هەروەها
نامۆبوونی. دواتر لە مانگی پێنج و شەشەوە ڕۆژمێرەکەی،
کارەکتەر و فۆرمی یاداشتنامە لە خۆدەگرێت و



نووسینەوەی شتەکان چڕتر و فراوانتر دەبن. لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٠٨ یشدا، کە سەرلەنوێ بە تەنگژەیەکی تری دەروونیدا دەروات، وازی لە نووسینی یاداشتەکانیشی هێناوە. ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانە، ئەوەیە، کە ئەم یاداشتگەلە هەر لە سەرەتاوە فۆرمێکی میتافیزیکی و فرە مانای لە خۆگرتووە، هەروەها لەبری زمانی سوێدی، بە زمانی فەرەنسی نووسیویەتی. بۆ ئەم مەبەستە، لە ژێر کاریگەرێتی و بیروبۆچوونەکانی نووسەری گەورەی سوێدی «ئیمانوئیل سوێدنبۆری» کە لە ساڵەکانی ١٧٠٠ەکاندا ژیاوە، دەست پێدەکات. بەڵام لە ساڵی ١٩٠٨دا بە چەند وشە و ڕستەیەکی ڕۆژانەی وەك (گوێزامەوە بۆ شەقامی شاژنی ژمارە ٨٥) کۆتایی بە نووسینی ئەم یاداشتگەلە دێنێت. ئەوەی ئاشکرایە ستریندبێری بیرۆکەی ئەم یاداشتگەلەی لە ئەنجامی تەنگەژەیەکی ئیکسنتیالیزمی و دینی، لە ناوەراستی ١٨٩٠ەکانەوە لەلای سەری هەڵداوە، خودی تەنگەژەکەش لە ساڵی ١٨٩٢ەوە، دوای جیابوونەوەی لە ژنی یەکەمی «سیری فۆن ئێسن» دەرکەوتووە. دواتر ستریندبێری سوێد بە جێدەهێڵێت و لە بەرلین نیشتەجێ دەبێت. یەکێك لە نیشانەکانی ئەم ڕەوشە نالەبارەش ئەوە بووە، کە ستریندبێری نووسەرێکی فرە بەرهەم بووە، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم بارودۆخەدا چیتر نەیتوانیوە بنووسێت. هۆکارەکانیشی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم نووسەرە هەستی بە گوناهو ئازار کردووە، ئەم هەستەش هەر لە منداڵێەوە لەگەڵیدا بووە، لە کاتی جیابوونەوەشی لە «سیری فۆن ئێسن» زیاتر و چڕ و قووڵتر دەبێتەوە. ستریندبێری، کە واز لە نووسینی یاداشتگەلەکەی دەهێنێت، بە تەواوەتی لە ژنی سێیەمیشی «هارییەت بوسن» جیابوەتەوە و لە خانووبەرە دڵگیرەکەشیان دەگوێزێتەوە بۆ تاوەرە شینەکەی لە شەقامی شاژن.

ستریندبێری بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە ئەم یاداشتگەلەی تیا تۆمارکردووە، ژیانی بە چەندین قۆناخدا تێپەڕیووە و کاریگەرییان بە سەر بەرهەمەکانییەوە هەبووە؛ بۆ نموونە هەر لەو ساڵانەدا، بە تایبەتی لە ساڵی ١٨٩٦ دا، وەك لەمەوبەر ئاماژەم بۆ کردووە، بە تەنگەژەیەکی دەروونی دژوار و بە هێزدا تێدەپەڕێت، ئەم تەنگەژەیەش لە ژیانی ستریندبێریدا بە قۆناخی «دۆزەخ» ناوزەد دەکرێت.
ستریندبێری لە دەستپێکی نووسینی ئەم یاداشتگەلەدا دەڵێت: (ژیانم کەوتە بارودۆخێکی گرانی ئەوتۆ، کە خۆم بە دۆزەخ ئاماژەم بۆ کردووە. لە ساڵی ١٨٩٧ یشدا، بۆ دووپاتکردنەوەیەکی ئەو دۆزەخەی ژیانم کتێبی (دۆزەخ) م نووسی، کە بووە خاڵێکی گرینگی وەرچەرخان و گۆرانکاری لە ژیانمدا.) ئەم قۆناخەی ژیانی ستریندبێری کە بە تەنگەژەی



دۆزەخ ئاماژەی بۆ دەکرێت، لە لایەن چەندین تۆیژەرەوە و پسپۆری تایبەتمەندەوە کاری لە سەر کراوە.

ستریندبێری هەر لەم ساڵانەدا سەفەری زۆری بۆ دەرەوەی وڵات، بە تایبەتی بۆ بەرلین و پاریس کردووە، کە لە ژنی دووەمیشی «فریدا ئول» جیادەبێتەوە، لە پاریس نیشتەجێ دەبێت. کە دەشگەڕێتەوە بۆ سوێد، لەبری ستۆکهۆڵم لە شاری لوند جێگیر دەبێت. هەر لەو ساڵانەدا زەماوەند لەگەڵ «هارییەت بوسێ» دەکات، شانۆی ئینتیم دادەمەزرێنێت و بە شێك لە شاکارە گەورەکانی، بۆ نموونە بەرەو دیمەشق، خەونە نمایشێك، سەمای مەرگ، دۆزەخ، ئاڵا ڕەشەکان و هەر سێ بەرگی کتێبی شین... هتد دەنووسێت.



ئەم نووسەرە بەردەوام لەگەڵ خۆی، دەوروبەرەکەی و کۆمەڵگاشدا لە کێشە و دابڕاندا بووە؛ بە شێوازی تر بیری کردۆتەوە، نووسیویەتی و بە فۆرمی جۆراوجۆر بەرهەمی تری خوڵقاندووە. ستریندبێری کەسێکی هەمیشە گەڕۆك و نا ئارام بووە، لە هیچ شوێنێك هەستی بە ئاسوودەیی نەکردووە و بە بەردەوامی هەموو شتەکانی لە دوای خۆیەوە بەجێهێشتوە؛ ڕاستییەکان، بیروبۆچوونەکانی، هاوڕێکانی، ژنەکانی، منداڵەکانی، ناونیشانەکانی، شار و وڵاتەکان. یاداشتەکانیشی، هەر وەك ڕۆمانەکانی، شانۆنامەکانی، نامەو یادەوەرییەکانی وێنەیەکی چڕ و وردی ژیانی خۆی بەرجەستە دەکەن، سەرگوزشتەی هونەرمەندێکی ڕەچەشکێنمان بۆ دەگێڕێتەوە و زیاتر لەم نووسەرەمان نزیك دەکاتەوە.

ئەم یاداشتگەلەی ستریندبێری لە هەموو ڕوویەکەوە بە دۆکومێنتێکی بێ رتووش و بیۆگرافیایەکی چڕ و ڕاستەوخۆ و وردی ژیانی ستریندبێری دادەنرێت. هەر خۆشی بە ماوەیەکی کورت، بەر لە مردنی باسی ئەوەی کردووە، کە ئەم یاداشتە پڕ لە ڕاز و نهێنیانە، دوا بەشەکانی ژیان و بیۆگرافیای ئەو پێك دەهێنێت. خوێنەر بە هۆی ئەم یاداشتگەلەوە زۆر لە ژیانی ڕۆژانە و بیرکردنەوەی نووسەرێکی گەورەوە نزیك دەبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی دونیای هەست و سۆزی بە شێوەیەکی چڕ و ڕاستەقینە، بەبێ هیچ دەمامکێك دەبینێت. بەڵام ئەوەی لێرەدا گرینگە دووپاتی بکەمەوە ئەوەیە، کە ئەم یاداشتگەلە بەرهەمێکی ئەدەبی خاوەن ستایل و فۆرمی تایبەتمەندی خۆی نییە و ستریندبێریش بەو مەبەستە نەینووسیوە. بەڵکو هەوڵێکی بێ شومار و گەورەی ئەم نووسەرەیە بۆ تێگەیشتن لە خودی خۆی و

دەووروبەرەکەی، ئەوەی لەو یاداشتگەلەدا تۆمارکراوە تەنها بۆ خۆی نووسیوە و لە سەرەتاشەوە مەبەستی بڵاوکردنەوە نەبووە. تاکو ئێستا تەنها بۆ پسپۆر و لێکۆڵەرەوانی ئەدەب و ژیانی ستریندبێری، ئەوەش بە شێوەیەکی سنوردار هەبووە، کە ئەم یاداشتگەلە نهێنیئامێزە ببین، بیخوێندنەوە و لە کارە شیکارییەکانییاندا سوودی لێوەربگرن[1].
هەڵبژاردەیەکی کورتی ئەم یاداشتگەلە، بە تایبەتی ئەو بەشەی کە باسی پەیوەندییەکانی ستریندبێری و دوا ژنی «هارییەت بوسێ» دەکات، لەگەڵ بەشێك لە نامەکانیان لە ساڵی ١٩٦٢ دا بڵاوکراونەتەوە. دەستنووسەکانی ئەم یاداشتگەلە لە بەشی ئەرشیڤی تایبەتمەند بە ستریندبێری لە کتێبخانەی پاشایەتی لە ستۆکهۆڵم پارێزراون[2].

## «هارییەت بوسێ» لە یاداشتەکانی ستریندبێریدا

کە کیژە ئەکتەری قەشەنگ «هارییەت بوسێ» لە ساڵەکانی ١٩٠٠ ەکاندا دێتە ژیانی ئەم نووسەرەوەو ستریندبێری سەرلەنوێ دەکەوێتە داوی عەشقێکی ئەبەدی و پڕ لە ژان و ئازارەوە، ئەم یاداشتگەلەش کارەکتەرێکی تر لە خۆدەگرێت و ئەو پەیوەندییە بەشێکی گەورەی بیرەوەری و خودی ئەو یاداشتانە داگیردەکات. بەوردی گیروگرفتەکانیان، نامەکانیان، ساتە خۆش و ناخۆشەکانیان و تەنانەت پەیوەندییە سێکسیەکانیشیان تۆماردەکات. زمانەکەی تۆنێکی تر لەخۆدەگرێت، لەگەڵ دەسەڵاتە نادیار و غەیبییەکاندا پێکدێتەوە (ئاشت دەبێتەوە جوانترە)، حەزێکی گەورە باوەش بۆ پاشەڕۆژێکی رووناکتر دەکاتەوە.
«هارییەت بوسێ» وەڵامی ئەم عەشقە ئەداتەوە، ئامێزی بۆ دەکاتەوە و لە ٦ی مانگی پێنجی هەمان ساڵدا زەماوەند دەکەن: ستریندبێری تەمەنی ٥١ ساڵ و هارییەت بوسێ ٢٢ ساڵ دەبێت. کە ئەو عەشقەش تەواو دەبێت و «هارییەت بوسێ» واز لە ستریندبێری دەهێنێت و دوای کەسێکی تر، هاوتەمەنی خۆی دەکەوێت، یاداشتەکانیش کۆتیاییان دێت و ستریندبێری چیتر یەك وشەی تری تیا نانووسێت، بەم شێوەیەش یاداشتەکان کۆتاییان پێ دێت. ستریندبێری لە ١١ ی مانگی شەشی ساڵی ١٩٠٨ دا دوا وشەکانی لەم یاداشتگەلەدا تۆمارکردووە، هەر لەم ڕۆژەشدا ئەو خانووەشی چۆڵ کردووە کە لەگەڵ زەماوەندکردنی «هارییەت بوسێ» چووەنەتە ناوییەوە. ستریندبێری بیست و نۆ ساڵ لە «هارییەت بوسێ» گەورەتر بووەو ئەم جیاوازییەش لە تەمەندا کاریگەری بەسەر ژیانی هەر دووکیان و سەرنەکەوتنی ژن و مێردایەتیەکەشیانەوە هەبووە. ستریندبێری دوای ژیانی چواردە ساڵ لە تاراوگە، دوو ژنی تر و خستنەوەی چەندین منداڵ،



نەیدەتوانی «هارییەت بوسن» یەکی گەنج و شۆخ رازی بکات و هەر زوو دەکەونە کێشەوە. دواتر «هارییەت بوسن» لە ساڵی ۱۹۳۲ دا سەبارەت بەو سەردەمە و نامەکانی ستریندبێری وتوویەتی (ستریندبێری بە تەمەن لە من زۆر گەورەتر بوو، ئەو ژیانی خۆی ژیابوو، لەگەڵ شتگەلەکانی ژیاندا تەواو ببوو، بەڵام من هێشتا هەر دەستم پێنەکردبوو.)

## نووسەرێك لە ناو خەون و  یاداشتگەلێکدا





ستریندبێری لە ماوەی ئەو یانزە ساڵەی کە یاداشتەکانی تیا تۆمارکردووە، ئێجگار بەرهەمی زۆر بووە، چەندین شاکاری گەورەی نووسیوە، ئەو بەرهەمانەی لەو قۆناخەدا نووسیونی لە سی بەرگی کۆبەرهەمەکانیدا کۆکراونەتەوەو بڵاوکراونەتەوە۳ بۆ نموونە ستریندبێری لە مانگی دووی ساڵی ۱۸۹۸ دا بە چەند ڕۆژێکی چڕ و کارێکی بەردەوام بەشی یەکەمی شانۆنامەی (بەرەو دیمەشق) ی لە پاریس نووسیوە، لەم بارەیەوە لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی ( ئەمرۆ چەند جارێك دەستم کرد بە گریان، کۆتایی پەردەی سێیەمم نووسی) ئەو گریانەی ستریندبێری جۆرێك بووە لە گریانی خۆشی، دوای تەنگەژەیەکی دەروونی قووڵ، دابڕان و نەخۆشی، توانیوویەتی سەرلەنوێ دەست بکاتەوە بە نووسین. دیمەن و دیالۆگەکان لە (بەرەو دیمەشق) بە شێوەیەکی ناتوریی و ساکار پێکەوەو لەناو یەکتریدا گەشەیان کردووە. هەروەها ستریندبێری لە زۆر بەشی ئەم یاداشتگەلەیدا، بە وردی ئەو خەونانەی کە بە شەو بینیوویەتی گێراوەتەوە و هەوڵیداوە لێکدانەوەیان بۆ بکات.
هەموو ئاماژەکان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە، کە ستریندبێری بەرهەمەکانی فرۆید، بەتایبەتی لێکۆڵینەوە دەروونییەکانی سەبارەت بە (خەون) و لێکدانەوەی (خەون) ی نەخوێندۆتەوە. بەڵام دونیای خەون جێگای سەرنجی ئەو بووە، هەوڵی داوە راڤەیان بکات و کۆدەکانیان شی بکاتەوە و بە ژیانی رۆژانەی خۆیەوە پەیوەستیان بکات. ستریندبێری لە ژیانی خۆیەوە، لە دەوروبەرەکەیەوە، لەو کەسانەوەی کە پەیوەندی هەبووە پێیانەوە، خەونەکانی لێکداوەتەوە. ستریندبێری لە ۱۹۰۸/٤/۱٦ دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لە خەویا لە هوتێلێکی گەورەدا بە دوای ژوورەکەی خۆیدا گەڕاوە، چووەتە ئەسانسێرێکەوە و دەست بەجێ لە ژێریدا پچڕاوە و بە گرمە گرمێکی گەورەوە کەوتۆتە خوارەوە، بەڵام ئەو قوتار بووەو لەم رووداوە کارەسات ئاسایەدا هیچی لێ نەهاتووە. ستریندبێری دەڵێت (خەبەرم بووەوە! بیرم کردەوە ڕەنگە

ئەوە شانۆی ئینتیم بێت، من وەکوو ئەسانسێرێك پیا سەرکەوتووم و لە ژێرمدا دارِما. یان ئەم خەوە مانای سەرلەنوێ بەئاگاهاتنەوەی عەشقەکەی منە بۆ هارییەت، کە گەنج بۆتەوە، هەروەها منیشی پاکژ کردۆتەوە، لە بەر ئەوەی من چواردە ڕۆژە هیچ مەیم نە خواردۆتەوە و بە وردی چاودێری خۆمم کردووە، ئەم کاتە بە عەشقی خۆی تێپەریوە و ئێستاش ئەو عەشقە کەم بۆتەوە و بەرەو نەمان دەچێت.)
ستریندبێری لە شاکارە گەورەکەیدا، شانۆنامەی (خەونە نمایشێك) زیاتر لە خەون نزیك دەبێتەوە، تەکنیکی خەون لە ئاستێکی باڵادا لە ستركتوری ئەو شانۆنامەیەدا بەکار دەهێنێت و دەرگایەکی نوێش بە ڕووی شانۆیەکی مۆدێرنی ئەوروپی دا دەکاتەوە.
ئەم یاداشتگەلە جگە لە تۆمارکردنێکی ژیانی ڕۆژانە و لێکدانەوەی خەون و پەیوەندییەکانی بە «هارییەت بوسێ» و قسەکردن لە سەر بەرهەمەکانی خۆی و نووسەرەکانی ئەو سەردەمە، نزیکەی سەد پارچە ڕۆژنامەی تیادایە، کە ستریندبێری ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکانی کردۆتەوەو بە لاپەرەکانی ئەم ڕۆژمێرەوەی نووساندووە. هەر بۆ نموونە، یەکێك لە هاوڕێکانی ڕەخنەگری دانیمارکی «جۆرج براندەس» وتارێکی رەخنەئامێزی بە تەنزی سەبارەت بە هەوڵە بێهودەکانی ستریندبێری و دروست کردنی ئاڵتون نووسیوە، ستریندبێریش ئەم وتارەی لە ڕۆژنامەکە کردۆتەوە و نووساندویەتی بە یەکێك لە ڕووپەڕەکانی یاداشتگەلەکەی و لە ژێریدا نووسیویەتی، گەوج و گێل! هەروەها لێرەو لەوێ لە سەر ڕووپەڕی ئەم یاداشتگەلە هەشتا وێنە، کە ستریندبێری خۆی دروستی کردوون هەیە و لەژێر هەر وێنەیەکیشدا بە چەند وشەیەك گوزارشتی لێکردووە، جگە لە ٢٨٢ پارچە کاغەزی تر، کە لەنێو لاپەرەکانی ئەم یاداشتگەلەدان و ستریندبێری شتی لە سەر نووسیون. ئەمەش وەك پاشکۆیەك وایە کە ستریندبێری دۆکیومێنت، هەواڵ، بابەتی بڵاوکراوەی ڕۆژنامەکانی کۆکردۆتەوە و دیدو بۆ چوونی خۆی لە سەر نووسیون و بەمەش وێنەیەکی کلتوری ژیانی ڕۆشنبیری ئەو کاتەی سویدمان بۆ دەپارێزێت.
ستریندبێری زۆرجار گەڕاوەتەوە سەر ئەم یاداشتگەلە، شتی لێ کوژاندۆتەوە، لە هەندێك شوێندا فۆرمەلەی نووسینەکانی کردۆتەوە، دێڕ و دەستەواژەی تری بۆ زیادکردوون، هەڵەی زمانەوانی چاك کردۆتەوە و لە ستركتورە گشتیەکەدا ڕێکی خستونەتەوە.

ستریندبێری لە هەندێك شوێنی یاداشتەکانیدا، بەتایبەتی کە ویستویەتی مەبەستی نووسینەکەی ئاشکرا نەکات، بە گریکی و لاتینی و فەرەنسی نووسیویەتی، بە تایبەتی گەر ناوی کەسێکی ناسراوی نووسێبێت، یان ئەو کەسانەی، کە پەیوەندییەکی گرژی هەبووە لەگەڵیان. هەروەها کە بە شێوەیەکی نزیك و کەسێنی باسی پەیوەندییەکانی خۆی،



بەتایبەتی پەیوەندییە سێکسیەکانی بە «هارییەت بوسن» یەوە دەکات، ئەوە کۆدی شاراوە و زمانی گرێکی کۆن بەکاردەهێنێت. ئەمە جگە لەوەی ستریندبێری لە هەندێك شوێندا سەنسووری دژی خۆی بەکارهێناوە و هەندێك لە تێکستەکانی لێرەو لەوێ کوژاندۆتەوە و بە قەڵەمێکی ڕەش خەتی بەسەدا هێناون٤.

## یاداشتگەلی نهێنی ئامێز




ستریندبێری لە سەرەتای ساڵەکانی ۱۹۰۰ ەکانەوە وشەی نهێنی، بەمانا دینییەکەی کە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگ و ریشە و چەمکە قووڵە رۆحی و دینییە تەموومژاوییەکان، دەنێت بە یاداشتەکانییەوە، بەم شێوەیەش دەبێتە یاداشتگەلێکی پڕ لە نهێنی. ستریندبێری هەر لە سەرەتای ئەم یاداشتگەلەدا وتەیەکی لە کتێبە دێرینەکانی دەستپێکی شارستانییەتی یەهودییەکانەوە وەرگرتووە و وەکوو سەردێری ئەم یاداشتگەلە تۆماری کردووە. ئەو وتەیەش بەم شێوەیە دەست پێدەکات: (ئەگەر تۆ دەتەوێت شتە نەبینراوەکان بناسیت، ئەوە بە دوو چاوی کراوەوە، بە ڕەهەندەوە لە شتە بینراوەکان بڕوانە.) ئەم یادەوەرییانە بۆ ئەم نووسەرە جۆرە ئامرازێك بووە بۆ جیاکردنەوەی ڕەهەندەکان، پاکژ بوونەوە، ڕووناك کردنەوەو کۆکردنەوەی دید و وەرگرتنی پەیامە ڕۆحییەکان.
ستریندبێری دەیەوێت لەم یاداشتگەلەدا هەموو شتە بینراوەکان هەر لە ڕووداوی ژیانی ئاسایی ڕۆژانەوە، تا دەگاتە پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی بە دەوروبەرەکەی، نێوەندە رۆشنبیری و کلتوریەکەی ئەو دەمەی سوێد، دەزگا چاپەمەنییەکان، وەرگێڕەکانی و تەنانەت ئافرەتانیشەوە، بە وردی تۆمار بکات. لە هەمانکاتدا شتە نەبینراوەکان؛ هەست کردن بە تارمایی، بیستنی دەنگی ناوەوەی خۆی، تێڕامانە هەنووکەییەکان و هەموو ئەو شتە نهێنیانەی لە دەوروبەری خۆی بینیوویەتی و هەستی پێکردووە، لەم دەروازەیەشەوە هێز و وزەیەکی رۆحی وەرگرتووە.
ستریندبێری بروای بە خوا هەبووە، لە نهێنییە دینییەکانی کۆڵیوەتەوە و تاقیکردنەوەی کیمیایی و دروست کردنی ئاڵتون، بەشێکی گرینگی ژیانی بووە، ئەمەش لە یاداشتەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، باسی کردوون، بە چاوی سەرنجەوە لە دیاردەو ساتە رۆحییەکانی خۆی و هێزە ئەزەلییە ئاسمانییەکانی کۆڵیوەتەوە. رەهەندە رۆحییەکەی ئەم نووسەرە چەندین ئاراستە لە خۆدەگرێت، زۆرجار دیدێکی میتافیزیکی ئاوێزانی بۆچوونەکانی دەبێت و لە دونیایەکی تەموومژاوییدا دەسوڕێتەوە، تەنانەت هەندێك لەو

وێنانەشی کە دروستی کردوون هێماگەلی دینی لەخۆدەگرن. ئەم نووسەرە لە ساڵی ١٩٠٤ لە یەکێك لە نامەکانیدا نووسیویەتی (خاچێکی ڕەشی تەختە و مێژووەکەم! ئەمە تەنها مۆنەمێنتێکە کە من داوای دەکەم)٥ ستریندبێری هەندێکجار دووپاتی ئەوەشی کردۆتەوە، کە ترسی ئەوەی هەیە لایەنە رۆحی و چەمکە نهێنیئامێزەکانی یاداشتەکانی بە هەڵە لێك بدرێتەوە، هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە دەیەوێت سیماو مۆرکە دینییەکەی رەوتێکی ئاسایی لە خۆبگرێت.

ستریندبێری وەك بیۆگرافیایەك سەیری یاداشتەکانی کردووە، بەشێك بووە لەو بەرهەمانەی کە لە ژیانی تایبەتمەندی خۆیەوە نووسیونی، بۆ نموونە «ژووره سورەکە» و «کوڕی کارەکەرەکە» و «وتاری بەرگری شێتێك» و «تەنهایی» و «نامەکانی» و «دۆزەخ»... هتد لە هەندێك لە کارەکانیدا گەڕاوەتەوە سەر یاداشتەکانی، سوودی لێوەرگرتوون و بەکاریهێناون. ستریندبێری بە تایبەتی، کە رۆمانی (دۆزەخ) دەنووسێت، گەراوەتەوە سەر ئەم یاداشتگەلە و بەشێکی دەقاو دەق تێهەڵکێشی سترکتور و رووداو و رۆنانی رۆمانەکە کردووە.

## شانۆی ئینتیم

ستریندبێری لە ساڵی ١٩٠٧ دا شانۆ تایبەتمەندەکەی خۆی (شانۆی ئینتیم) لە ستۆکهۆڵم دادەمەزرێنێت، دامەزراندنی ئەم شانۆیەش پانتاییەکی گرینگ لە یاداشتەکانیدا لە خۆدەگرێت. هەر ئەم شانۆیەش گیروگرفتی مادی



بۆ دروست دەکات، کرێی شانۆکە، مووچەی ئەکتەرەکانی و دارایی بەڕێوەبردنی شانۆکە دەبنە تەنگەژەو سەر ئێشە بۆ ستریندبێری، هەر بۆ نموونە دەستبەجێ پێویستی بە دوو هەزار کرۆن بووە بۆ ئەوەی یەکەم کرێی شانۆکەی بدات. ئەم رەوشە ستریندبێری ناچار دەکات، بە نابەدڵی و بێزارییەوە بیر لە فرۆشتنی یاداشتگەلەکەی بکاتەوە٦.
ستریندبێری بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی کردووە بە دەزگای (بۆنیەش)ەوە، تاکە مەرجیشی بۆ فرۆشتنی ئەم یاداشتگەلەی ئەوە بووە کە لەلای خۆی بمێنێتەوە تا بتوانێت بەردەوام بێت لە نووسینی رۆژانەی خۆی. لەم ڕووەوە لە نامەیەکیدا بۆ دەزگای ناوبراو دەڵێت (ئێوە دەبێت ئەو بڕوایەتان بە من هەبێت، کە یاداشتگەلەکە لەلای خۆم بمێنێتەوە، تابتوانم بەردەوام بم لە نووسینی یاداشتەکان و بەم شێوەیەش گەشە بکات و هەڵبکشێت... من ئەم یاداشتگەلە بۆیە دەفرۆشم تا کرێی شانۆکەمی پێ دابین بکەم، گەرنا ئەمە بازرگانی نییە کە بەم یاداشتگەلەوە دەیکەم!

ئەگەر ئێوە هیچ ڕێگایەکی تر لەبری ئەمە شك دەبەن، ئەوا پێم بڵێن! بێگومان ئێوە دەتوانن یاداشتگەلەکە لەلای من ببینن.) ستریندبێری مەبەستی بووە یاداشتگەلەکەی بە بارمتە دابنێت، تا بەو شێوەیە شانۆکەی لە تەنگەژەی دارایی و داخستن رزگار بکات٧. ستریندبێری لە نامەیەکی تریدا بۆ دەزگای بۆنییەش دەڵێت ( کە بیر لە فرۆشتنی ئەم یاداشتگەلە، وەك شتێکی کەسێنی خۆم دەکەمەوە، هەست دەکەم لاشەی خۆم کە شیکاری جەستەیی بۆ کراوە، فرۆشتبێت.) ستریندبێری دەتوانێت لە ٧ ی مانگی سێی ساڵی ١٩٠٨ دا یاداشتگەلەکەی لە دەزگای بۆنیەش بکرێتەوە، دوای کرینەوەشی لە پەراوێزی بەرگی ناوەوەی دەفتەری یاداشتەکانیدا دەنووسێت (ئەم یاداشتگەلە نابێت هەرگیز چاپ بکرێت! ئەمە دوا داوای منە! دەبێت جێ بە جێ بکرێت.)٨ کە ستریندبێری بە تەواوەتی واز لە نووسینی یاداشنامەکەی دەهێنێت و هیچ هیوایەکی بە گەڕانەوەی «هارییەت بوسێ» نامێنێت خۆی تەرخان دەکات بۆ شانۆی ئینتیم، نووسینی شانۆنامە، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی، گفتووگۆ و وتاری رەخنەیی.



## یاداشتگەلێك لە سەر شانۆ

شانۆی شار لە ستۆکهۆڵم، بە بۆنەی سەد ساڵ بە سەر کۆچی دوایی ستریندبێری و بۆ یەکمجار بڵاوکردنەوەی ئەم یاداشتگەلە نهێنییەی ئەم نووسەرە گەورەیەدا، یاداشتگەلەکەیان کردووە بە شانۆ. یاداشتگەلێکی نهێنی لە سەر شانۆکەی ستریندبێری، ئەو شانۆیەی سەد ساڵ لەمەوبەر یاداشتەکانی بۆ فرۆشت، شانۆی ئینتیم نمایش دەکرێت. ریژیسۆری شانۆنامەکە هەر خۆی لە دیدێکی هونەری چڕەوە، لە تێروانینێکی شانۆیی و لە رووبەرووبوونەوەی نهێنییەکانی ستریندبێریدا دەقەکەی ئامادەکردووە. ئەم ڕێژیسۆرە بۆ ئەوەی قۆناغەکانی ژیانی ستریندبێری، لە ماوەی نووسینی یاداشتگەلەکەیدا بەرجەستە بکات، پێنج کارەکتەری ستریندبێری لە پێنج قۆناخدا دروست دەکات. ئەم پێنج کەسایەتییە کە بەرجەستەی ژیان و کارەکتەری ستریندبێری لە پێنج قۆناخی تەمەنیدا دەکەن، رووبەرووی «هارییەت بوسێ» دەبێتەوە. لەهەمانکاتدا بە ناوەوەی خۆیدا رۆدەچێت، شەڕ لەگەڵ خۆی دەکات، لە دیاردە نهێنییەکان دەکۆڵێتەوە، دەبێتە کەسێکی جادوگەر، کۆدی نهێنییەکان دەکاتەوە و شتە بینراوەکان، هەست پێکراوەکان ئاڵۆز دەکات. بەڵام ریژیسۆر لە ئامادەکاری ئەم دەقەدا چەندە گرینگی داوە بە ژیانی ستریندبێری لە نێو

یاداشتگەلەکەیدا، هێندەش «هارییەت بوسێ» وەك ئافرەت، وەك
ئەکتەر، وەك خێزان، هاورێ، هاودەم و دوژمن، لە چەقی رووداوەکاندایە.
ستریندبێری و هارییەت بوسێ لە نێو ئەم رووداوە پڕ لە ڕازو
نهێنیانەوە، لە سترکتورێکی ئەسرار ئەنگیزەوە، دێنە دەرەوە، لە رۆژێکی
رووناکدا، بە بەرچاوی بینەرەکانیانەوە، لەگەشتێکی پڕ لە ژان و ئازارو
خۆشەویستیدا بەیەك دەگەن، لەیەك دادەبڕێن و دەروازەکانی ژیان لە
دۆزەخەکەی ستریندبێرییەوە، بۆ نامە لێوانرێژەکانی بە خۆشەویستی،
رق و دەمەدەمەکانەوە دەکەنەوە.
نمایشی «یاداشتگەلێکی پڕ لە نهێنی» وێنەیەکی ڕاستەقینەی
ستریندبێریمان، لە نووسینی ستریندبێری خۆی پێشکەش دەکات.






## پەراوێزەکان

١ . بۆ یەکمجار و لە ساڵی ١٩٦٢دا، دوای پەنجا ساڵ بەسەر مردنی ستریندبێریدا، ئەم یاداشتانە دەخرێنە بەر دەستی پسپۆرو لێکۆڵەرەوانی بواری ئەدەب و بەرهەمەکانی ستریندبێرییەوە.

٢ . هەموو ئەرکیڤی ستریندبێری دوای مردنی لە مۆزەخانەی باکوور هەڵدەگیرێت، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٢ەوە گوێزراوەتەوە بۆ بە شێکی تایبەتمەند لە کتێبخانەی پادشایەتی لە ستۆکهۆڵم.

٣. ئەو بەرگەی کە تایبەتە بە ساخکردنەوەی ئەم یاداشتگەلە و ئەم ساڵ پێکەوە لەگەڵ یاداشتەکەدا دەرچووە، بە تایبەتی تیشکی سەرنج و لێکۆڵینەوەیان خستۆتە سەر ژیانی ستریندبێری لە نێوان ساڵانی ١٨٩٦-١٩٠٨ دا، هەروەها ئەو بەرهەمانەیشی کە لەو ساڵانەدا نووسیونی.

٤ . دەزگای چاپەمەنی نورشتێد، بە ئامێری لێزەرو تەکنیکێکی باڵاوە هەموو ئەو شوێنانەی کە ستریندبێری کوژانوویێتیەوە، پاک کردۆتەوە، بەتایبەتی ئەو تێکستانەی کە باسی وردەکارییەکانی شەوی زاوایەتی خۆی لەگەڵ هارییەت بوسێ دەکات و ئێستا لە چاپەکەدا بە باشی دەخوێندرێنەوە.

٥. ئێستا خاچێکی رەشی لە تەختە دروست کراو بە ژوور سەری گۆرەکەی ستریندبێری لە یەکێک لە گۆرستانەکانی ستۆکهۆڵم بەرز بۆتەوە.

٦ . ستریندبێری کە لە مانگی ١٠ ی ساڵی ١٩٠٧دا ویستوویەتی یاداشتەکانی بفرۆشێت، تا ئەو کاتەش بەردەوام بووە و رۆژانە یاداشتەکانی خۆی نووسیوە.

٧ . ستریندبێری لە کاتی فرۆشتنی یاداشتگەلەکەیدا وشەی (یاداشتگەلێکی پڕ لە نهێنی) کە لەسەر بەرگی دەرەوەی دەفتەری یاداشتەکانی نووسی بووی، وەک نەزمێکی گاڵتە ئامێز دەخاتە ناو دوو کەوانەوە.

٨ . ستریندبێری لە نامەیەکدا بۆ (ئاکسل ستریندبێری) برای ناردووە، داوای ئەوەی لێکردووە کە لە دوای مردنی، دەبێت ئەو ئەم یاداشتگەلە لەلای خۆی هەڵبگرێت.



# پەنجەرەیەکی بچوك بەسەر جیهانێکی فراواندا

خوان خۆسیە میاس...

عەتا محەمەد

جارێك لەو جارە زۆرانەی بەدوای رۆمانێکدا دەگەڕام بۆ خوێندنەوە، بەرێکەوت رۆمانێکی قەبارە بچوك هات بەدەستمەوە، کە نزیکەی ١٨٠ لاپەڕە دەبوو. دیمەنی بەرگەکەی هیچ پاڵنەر نەبوو بۆ خوێندنەوەی، لەبەر ناشرینی دیزاینەکەی، کە هەر بە بەرگی کتێبێکی ئابوری دەکرد. تەنانەت ناوی رۆمانەکەش تەنیایی ئاوها بوو، بەلامەوە سەرنجڕاکێش نەبوو. بەوەی زۆر بەناوی رۆمانی بازرگانی یاخود سۆزداری



دەکرد. بەڵام ناوی نوسەرەکەی بۆ من سەرنجڕاکێش بوو خوان خوسیە میاس. من پێشتر ئەو ناوەم نەبیستبوو، کە گومانی ئەوەم کرد ئیسپانی یاخود پورتوگالی بێت. ڕۆماننوسانی ئەو زەمانانەش جێگا بایەخی منن.
هەمیشە لە دۆخی وادا بەخۆم دەڵێم: جیهان جێگای ئەو هەموو ناشرینییەی تێدا دەبێتەوە، منیش بەرگەی خوێندنەوەی ڕۆمانێك دەگرم، ئەگەر بەلامەوە جوان نەبوو. یاخود لە کوێدا نەمویست، دەتوانم دەستبەرداری خوێندنەوەی ببم.
بەڵام ئەو ڕۆمانە دەروازەیەك بوو، بۆ گەڕانم بەدوای ڕۆمانی دیکەی میاس و پەیداکردنی ڕۆمانێکی تری بەناوی لاوراو خۆلیۆ و چەند کورتە چیرۆکێکی. میاس تا ئێستا لە ژیاندا ماوە. ئەو ١٩٤٦ لە بالنیثا لەدایك بووەو دواتر چۆتە مەدرید و لەوێ ئەدەب و فەلسەفەی خوێندووە. پاشان لە بواری ڕۆژنامەگەریدا کاری کردووە. یەکەم ڕۆمانی لە ١٩٧٤ بەناوی عەقڵ سێبەرە، بڵاودەکاتەوە. جگە لەوەش، بەشێوازێکی تایبەت کورتە چیرۆك، وتار و وتارە چیرۆکیش بۆ گۆشەی ڕۆژنامە دەنوسێت.

دیارە من ناتوانم لەسەر ئەزمونی میاس قسەبکەم، کە بەپێی ئەو ژیاننامە کورتەی من خوێندومەتەوە، ٢٢ ڕۆمان و چەندین خەڵاتی هەیە. لەم ٢٢ ڕۆمانەشی، من تەنها دوو ڕۆمانیم خوێندۆتەوە. بەڵکو ئەگەر قسەیەکم هەبێت، ئەوا لەسەر ئەو دوو ڕۆمانەیەتی. کە سادەییەکی زۆریان تێدایە و ئەمەش زۆر جێگا سەرنجی من بوون. بەوەی میاس وردە وردە بە زمان و ڕوداوێکی سادە، بەرەو ڕووبەرێکت دەبات، کە چاوەڕێت نەکردووە. ڕوبەڕوی دەرئەنجامی وات دەکاتەوە، کە یەکەمجار توشی گومان دەبیت لەوەی شتی وا ئیمکانی هەبێت. پاشان هەر لەو سادەییەدا باس لە هەست و سۆزی کەسەکان و پەیوەندییان بە چواردەوریانەوە دەکات، کە ئەم خاڵە لەکاتی خوێندنەوەدا، میلان کۆندێرای دەهێنایەوە یادم.

هەردوو ڕۆمانی تەنیایی ئاوها بوو و لاوراو خۆلیۆ دەستپێکێکی هاوشێوەی یەکیان هەیە، کە بەراوردم کردن، وا هەستم کرد دەستپێکی یەکێکیان، ڕەشنوس بووبێت. ـ ئێلینا خەریکی لێکردنەوەی مووی قاچی بوو لە حەمام، کە زەنگی تەلەفونەکە لێیدا، تا پێی بڵێن دایکی مردووە.
بەڵام ڕۆمانی لاوراو خۆلیۆ: ـ ئەم شوقەیە، کە ئێستا زەنگی تەلەفون تێیدا لێدەدات، لە دوو



ژوور و سالۆنێك پێكهاتووە و بەسەر شەقامێكی تەسكدا دەڕوانێت لە ناوەڕاستی شاردا. زەنگی تەلەفونەكەش بۆ ئەوە لێدەدات، تا بە لاورا و خۆلیۆ بڵێن مانۆیل مردووە.
ڕۆمانەكە بە هەواڵی مردن دەستپێدەكات و ئێلینا وەك مێرسۆی ڕۆمانی نامۆی كامۆ، كاتێك هەواڵی مردنی دایكی دەدەنێ، كە نەخۆشی شێرپەنجەی هەبووە، خوێنساردانە و بێ هیچ ڕاچڵەكینێك هەواڵەكە وەردەگرێت. وەك ئەوەی بەلای ئێلیناوە دەمێك بێت دایكی مردبێت.
ئێلینا مێرد و كچێكی شووكردووی هەیە. بەڵام دوورییەكی زۆر لەنێوان ژیانی ئەم و مێردەكەیدا هەیە، بەوەی مێردەكەی مرۆڤێكی ئەم سەردەمەیە، كە ژیانی ڕۆژانە لەگەڵ خۆیدا بردویەتی و ئێلیناش لە گۆشەگیریدا سەردەكاتە خواردنەوە و حەشیش. ئەو لە تەنیایی و گۆشەگیریدا دەژی. لە وردەكاری ژیانی ئێلیناوە تێدەگەین، هیچ گەرموگوڕی لە پەیوەندییەكانیدا نەماوە. تەنانەت كە دەچن بۆ ماڵی دایكی، ئەم خۆی لەباسی میراتییەكەی دایكی دەدزێتەوە و دەڵێت هیچ شتێكی لە میراتەكەی ناوێت و بەدزییەوە یاداشتە ڕۆژانەییەكانی دایكی هەڵدەگرێت، تا كە گەڕایەوە، دەست بە خوێندنەوەی بكات، ئەم یاداشتانەش قورسایی خۆیان دەبێت لەسەر ڕوونكردنەوە و ئاشكراكردنی هەندێك پەنهانی ژیانی ئێلینا.
ئیدی بەدەم كێشانی حەشیش و تەنیاییەوە، یاداشتە ڕۆژانەییەكانی دایكی دەخوێنێتەوە و تێیدا زۆر هەست و سۆز دەدۆزێتەوە، كە هاوشێوەی هەستو سۆزی خۆیین. تەنانەت ڕاو سەرنجی دایكی دەخوێنێتەوە لەسەر خۆی. ئەمەش وای لێدەكات لە سروشتی ژیانی خۆیو



نشوستییەكانی رابمێنێت. لەوێدا وا دێت بە خەیاڵیدا كە لەبارەی مێردەكەیەوە شت بزانێت. بۆ ئەمەش هەواڵگرێك بە پارە دەگرێت، (بێئەوەی بهێڵێت ئێلینا بناسێت و زۆر بە نهێنی و وردی پەیوەندی لەگەڵ دەبەستێت) تا چاودێری مێردەكەی بكات و ڕاپۆرتی وردی لەبارەوە بنووسێت. هەواڵگرەكە وادەكات و بۆ ئێلینای ئاشكرادەكات، كە مێردەكەی پەیوەندی لەگەڵ فەرمانبەرێكدا هەیە، كە لەگەڵیدا كاردەكات. ئێلێنا لەماڵەوە ئاسایی هەڵسوكەوت دەكات و خۆی وا نیشان نادات، كە بەو پەیوەندییە دەزانێت.
بەڵام جوانی ڕۆمانەكە لەوەدایە، كە فزولیەتی ئێلینا پەلدەهاوێت بۆئەوەی لەبارەی خۆیەوە بزانێت. هەربۆیە داوا لە هەواڵگرەكە دەكات لەبارەی ئێلیناوە ڕاپۆرتی وردی بۆ بنوسێت.
ئەم ئارەزووەی ئێلینا وەك ئەوە وایە كە بمانەوێت لە چاوی ئەوانی دیكەدا، یاخود لەبەردەم پزیشكی دەرونیدا حەقیقەتی خۆمان ببینین. وەك ئەوەی ئێلینا بۆ ئاوێنەیەك بگەڕێت تا وێنەی خۆی تێدا ببینێتەوە. لێرەدا بۆمان ئاشكرا دەبێت، میاس پێچەوانەی سارتەر، كە دەیوت ئەوی دیكە دۆزەخە،






ئەوی دیکە دەکاتە ئاوێنەیەك بۆ ناسینی خود.
هەواڵگرەکە لە چاودێری کردنی بۆ ئێلینا و نووسینی راپۆرتی زۆر ورد لەسەری، تووشی داوی خۆشەویستی ئێلینا دەبێت.
لە رۆمانەکەدا ئێلینا زۆر بەدوای مانای ژیانیدا دەگەڕێت، کە زەمانێکە هەموو هەستێکی بەرانبەری لەدەستداوە. بەڵام ئارەزوییەکی زۆری هەیە بۆ ئاشتبوونەوە لەگەڵ خۆیدا و بگەڕێتەوە سەر ئەوەی ژیانی خۆشبوویێت، ناچار ژیانی هاوسەری بەجێدەهێڵێت تا بەدوای دۆزینەوەی خۆی و مانای ژیانیدا بڕوات.
پێش دەستپێکردنی رۆمانی تەنیایی ئاوها بوو، بڕگەیەك لە رۆمانی مەسخی کافکا هەیە. وەك ئەوەی میناس بیەوێت پێشوەخت پێمان بڵێت، رۆمانەکەی ئەمیش لەسەر دۆخی گۆڕانی مرۆڤە. بەڵام ئەم گۆڕانە بەرەو دەعەجانبوون، یاخود مێروو نییە وەك لای کافکا هەیە. بەڵکو لای میاس دۆخی گۆڕانی ئێلینا بەرەو شتێکی ترە کە دەکرێت بە (هاوشێوە) ناوی بەرین. بیرۆکەی هاوشێوە و هاوەڵی مرۆڤ، بریتییە لەوەی کە ئێمە تەنیانین لە ژیانداو هەرکەسە و هاوشێوەیەکی هەیە لە شوێنێکی تر دەژی، کە لە ساتی نزیك بوونەوەی لەمردن، هاوشێوەکەی دەردەکەوێت تا بەشێوەیەك پێیبڵێت کە ساتی ماڵئاوایی کردنی نزیك بۆتەوە. بیرۆکەی بوونی هاوشێوە، ئێلینا لە رێگای یاداشتەکانی دایکییەوە دەیدۆزێتەوە، کە زۆر باوەڕی بەم بیرۆکەیە هەبووە. بۆشی دەردەکەوێت دایکی ناوی ئێلینای لێناوە، چونکە ناوی هاوشێوەکەی خۆیەتی.
هەر لە بیرۆکەی هاوشێوەبوونەوە تێدەگەین، کە لێکچونی نێوان ئێلینا و دایکی هۆکارێك بووە بۆ کێشە بەردەوامەکانی نێوانیان. هەرچۆن ئەم هاوشێوە بوونەش لەنێوان ئێلینا و مەرسیدسی کچیدا هەیە. وەك ئەوەی ئێمە لەبەردەم چیرۆکێکدا بین، کە سێ روو یاخود کەسایەتی هەبێت.

رۆمانی لاوراو خۆلیۆ، بەهەمان شێوە باس لەپەیوەندی نێوان لاوراو خۆلیۆی ژن و مێرد دەکات، ئەو گرفت و تەنیاییەی تێیدا دەژین، کە سەرئەنجام لاورا زۆر کتوپڕ داوای جیابوونەوە دەکات. خۆلیۆ ئەندازیاری دیکۆرە و لاوراش لە شوێنی مەساژ کاردەکات. مانۆیلی دراوسێشیان، کە لەسەرەتای رۆمانەکەدا دەزانین، توشی روداو بووەو لە بیهۆشیدا دەژی لە خەستەخانە.

میاس دەڵێت: کاتێك سیانزە ساڵان بووم، دایکم ناردمی لێوانێك ڕۆن لەماڵی دراوسێکەمان بهێنم. کاتێك چوومە شوقەکەیانەوە، حەپەسام، چونکە بینیم سەد دەر سەد هاوشێوەی شوقەکەمانە، بەڵام ئەوەی لە ماڵی ئێمە لای چەپەوە بوو، لەماڵی دراوسێکەمان دەکەوتە لای ڕاستەوە. ئیدی کاتێك هاتمە دەرەوە، ئەو مرۆڤەی پێشوو نەبووم. لەوکاتەوە میاس باوەڕی بە بیرۆکەی لێکچوون یاخود هاوشێوەبوون هەیە و ئەمەش دوای چل و سێ ساڵ، لە ڕۆمانی لاوراو خۆلیۆدا دەنوسێتەوە و قورساییەکی زۆری هەیە لە ڕۆمانەکەدا.
بەهەرحاڵ ئەوەی لەم ڕۆمانەدا زۆر سەرنجڕاکێش بوو بۆم، بوونی چەندین چیرۆك و حیکایەتە، کە خۆلیۆ دەیانگێڕێتەوە. من لێرەدا نامەوێت لەبارەی وردەکارییەکانی ڕۆمانی لاوراو خۆلیۆوە بدوێم. بەڵکو هەوڵئەدەم یەکێك لەو حیکایەتانە بنوسمەوە کە لە ڕۆمانەکەدا هەیە. ئەویش کاتێك خۆلیۆ، بۆ ئەو کچە منداڵەی دەگێڕێتەوە، کە ناوی خۆلیایەو کچی زڕ خوشکێتی.

بەڵام پێش ئەو حیکایەتە، دەمەوێت ئەو چیرۆکە بنوسمەوە، کە شەوی کریسمیس، خۆلیۆ لەماڵی باوکی و بە ئامادەبوونی باوکی، زڕدایك و زڕخوشکەکەی دەیگێڕێتەوە:

- لە چاوەڕوانی موشتەرییەکدا دانیشتبووم، کاتێك گوێم لە وتووێژی نێوان دوو کچ بوو، کە پانزە ساڵییان تێنەپەڕاندبوو.. یەکێك لەوان، خەونێکی بۆ ئەوی تر دەگێڕایەوە و دەیوت لەگەڕانەوەیدا لە قوتابخانەوە بۆ ماڵەوە، تێبینی دەکات، کە باوکی خۆی کردووە بە دایکی و دایکیشی خۆی کردووە بە باوکی. هەر زوو دەرك بەم بارودۆخە دەکات،



بەڵام ناوێرێت هیچ بڵێت. دوای چەند ڕۆژێك، بەوپێیەی هێشتا دایك و باوکی هەر لەو دۆخەدان، کچەکە پێشنیار بۆ براکەی دەکات، ئەمانیش ڕۆڵی خۆیان لەگەڵ یەکتر بگۆڕنەوە، بێئەوەی کەس لە باوان یاخود مامۆستا و هاوڕێکانیان تێبینیان بکەن. کیژۆڵەکە حەز لە نزیکترین هاوڕێی براکەی دەکات، کە لەم ڕۆڵە نوێیەیدا خوی پێوە گرتووە... ڕۆژێك کچەکە بۆئەوەی هیچ ڕێگرێك لەبەردەمیدا نەهێڵێتەوە، بە کوڕە هاوڕێکەی دەڵێت، کە ئەم کچە، ئەگەرچی لە کوڕ دەکات. کوڕە هاوڕێکەشی پێیدەڵێت ئەمیش کچە، نەوەك کوڕ. پاشان دەڵێت: (منیش خۆم لە شێوەی براکەمدا گۆڕیوە).

یەکێك لە چیرۆکە کورتەکانی تری کە لەو ڕۆمانەدا هەیە، ئەم چیرۆکەیە لەبارەی ڕۆژەکانی هەفتەوە:
(...کاتژمێرێکی تەختە، کە ژمارە و میلەکانی بە ڕەنگی جیاجیا بوون، تا خۆی خۆلیا فێری کاتژمێر خوێندنەوە بکات، هەروەها کتێبێکیشی کڕی، کە حیکایەتەکەی لەبارەی ڕۆژەکانی هەفتەوە بوو. کتێبەکە نوسینی کەم و ڕەنگی زۆر بوو. حیکایەتەکە باسی




منداڵێکی دەکرد، کە جارێك لەوکاتەی هەموو جیهان لە ساتێکی دیاریکراودا لە یەك شەممەوە دەچوون بۆ دوو شەممە، توانی لە سوچێکی یەك شەممەدا خۆی بشارێتەوە تا نەچێتەوە بۆ قوتابخانە. کاتێکیش دایك و باوکی دەزانن گەشتونەتە دووشەممە بەبێ منداڵەکەیان، هەوڵ ئەدەن بگەڕێنەوە رۆژی یەك شەممە تا لەگەڵ خۆیانی بەرنەوە. بەڵام ئەوە مەحاڵ دەبێت. ئیدی منداڵەکە شەش رۆژی تەواوی بەتەنیا بەسەربرد، تا خێزانەکەی لەگەڵ جوڵەی هەفتەدا سوڕانەوە و سەرلەنوێ رۆژی یەك شەممە هاتەوە. حیکایەتەکە لەبارەی سەرچڵییەکانی منداڵێکەوە بوو، کە لەرۆژێکی بەتاڵدا گیردەخوات، بێ هاوسێ، بێ رێبوار، بێ لە پیاوانی پۆلیس، تەنانەت بێ لە ئاژەڵی ماڵی. چونکە ئاژەڵەکانیش لە رۆژەکانی هەفتەدا وەك بنیادەم دەسوڕانەوە. کاتێکیش منداڵەکە دەدۆزنەوە، لە مردندایە. بەڵام دوای ئەوەی تەندروستی باش دەبێت و پەشیمان دەبێتەوە لەو کارەی، لەپێناو چاکەدا ئەم توانایەی تەرخاندەکات بۆ سەفەرکردن بە زەمەندا و بۆ رزگارکردنی ئەو منداڵانە بەکاری دەهێنێت، کە لە رۆژە هەڵەکانی هەفتەدا ون بوون).

ئەو دوو چیرۆکە کورتە، دەتوانن جیهانی خوان میاسمان نیشان بدەن، کە چۆن لەسەر کورت نوسین و کتوپڕی وەستاوە.
ئەوەی لەو دوو رۆمانە بچوکەی خوان خوسییە میاس بۆ من گرنگە، ئەوەیە کە بە زمانێکی سادە و روداوی ئاسایی، دەتوانێت بەوردی لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان، پرسیار و خەون و خولیایان وردبێتەوە و دنیایەکی بچوك، بەڵام پڕ لە رازو پرسیار بخوڵقێنێت.

حیکایەتی سێبەرشۆرییەك

- دەمەوێت حیکایەتێکم لەبارەی سێبەرەوە بۆ بگێڕیتەوە.
بەدەوری مێزەکەی مەتبەخدا دانیشتن و خۆلیۆ دەستی بە گێڕانەوەی ئەم حیکایەتە کرد:
- هەبوو نەبوو لە سێبەرشۆرییەك.
- سێبەرشۆری چییە؟

- شوێنێکە خەڵکی بۆی دەچن، تا لەوێ سێبەرەکانیان
پاك بکەنەوە، هەرچۆن جل و بەرگەکانیان پاك دەکەنەوە.
ئیدی هەموو ساتێك قسەم پێمەبڕە.
- دەی...
- بەڵام خەڵکانێك هەبوون دوای ئەوەی سێبەرەکەیان
بەجێدەهێشت بۆ پاك کردنەوە، ئیدی نەدەگەڕانەوە تا
بیبەنەوە.
- بۆچی؟
- چونکە ئەوان بیریان دەچوو، یاخود لەبەرئەوەی دەمردن،
یاخود پارەیەکی وایان نەبوو تا حەقی شۆردنەکەی بدەن.
ئیدی هەموو مانگێك چەند سێبەرێك دەمایەوە، کە
نەبرابوونەوە.
- ئەی چییان لێ دەکردن؟
- لە گەنجینەیەکدا دەیانپاراستن، ترسی دەخستە
دڵی ئەوکەسەی سەیری بکردایە. چونکە ئەم سێبەرە
بەجێهێڵدراوانە لە ئازاردا دەلەرزن، لەبەرئەوەی تەحەمولی
ئەوە ناکەن کە جەستەیەك نەبێت، لەدواوەی بڕۆن، وەك
جیرەی دەرگا. چونکە سێبەرەکان ژیانێکی کەمیان هەیە.
ئەگەر تۆ سێبەرەکەت لەسەر سیسەمەکەت بەجێهێشت،
ئەوا ناتوانێت بۆ خۆی بجولێت، چونکە هێزی
نییە. هەرچۆن توانای ئەوەی نییە بگری،
ئەگەرچی دەتوانێت کەمێك ببزوێت.
لەو سێبەرشۆرییە منداڵێك کاردەکات،
هەندێکجار دادەبەزێتە خوارەوە
بۆ گەنجینە جێهێڵدراوەکە تا
گوێ لە ناڵەو نرکەی
سێبەرەکان بگرێت.



ئەمەش شتێك بوو تووشی ترس و خەفەت،
دڵتەنگی و خۆشیی دەکرد. ئەم منداڵەی
باسی دەکەم، عاشقی سێبەری کچێك دەبێت.
سێبەرێك لەوپەڕی جوانیدا، جلێکی تەسکی
لەبەردایە و قژێکی درێژی بەرداوەتەوە هەروەك
قژی تۆ. کاتێك سێبەرەکە دەجولایەوە، لەسەر
دیوارەکە وێنەی وەك وێنەی مەرەکەبی
دروست دەکرد. هەندێکجار منداڵەکە باوەشی
بەم سێبەرەدا دەکرد، سەمای لەگەڵ دەکرد
یاخود ماچی دەکرد. بەڵام سێبەرەکە بەختەوەر
نەبوو، بەهەمان نابەختەوەری دەستێك، کە لە
لاشەیەك جیابۆتەوە. ئیدی منداڵەکە بەدوای
ناوی ئەو کەسەدا گەڕا کە سێبەرەکەی هێنابوو
بۆ سێبەرشۆرییەکە و زانی کچەکە لەکوێ
دەژی.
ڕۆژێك، کە لە سێبەرشۆرییەکە دەرچوو، چوو
بۆ ئەو ناونیشانە و لەدەرگایدا. ئافرەتێك بە
بەرگی پرسەوە دەرگای لێکردەوە. کوڕەکە وتی:
من لە سێبەرشۆرییەکەوە هاتووم. سەرۆك
کارەکەم پێیوتم کە بەڕێزتان ئەو سێبەرەتان
نەبردۆتەوە، کە شۆردراوە و پاك کراوەتەوە.
سێبەرەکەش هی کچێکە، قژێکی درێژو
بەرداوەی هەیە و جلێکی تەسکی لەبەردایە.
ئافرەتەکە دەنگی گریانی هات و وتی سێبەری
کچەکەیەتی، کە بە دیفتریا مردووە. هەربۆیە
نەهاتوون بۆ سێبەرشۆرییەکە تا وەریبگرنەوە.
پێش ئەوەی ئافرەتەکە دەرگاکە دابخات، وتی:




چی لێدەکەن لێیبکەن.

منداڵەکە گەڕایەوە بۆ سێبەرشۆرییەکە، کە داخرابوو، ناچار لە پەنجەرەکەیەوە چووە ژورەوە. دواتر مۆمێکی داگیرساند و بەرەو گەنجینەکە چووە خوارەوە. لەبەرئەوەی کات شەوبوو و بێدەنگیش باڵی کێشابوو بەسەر شوێنەکەدا، پێش ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە گوێی لەو ناڵە پڕ لە ئازارانە بوو، کە لە سێبەرەکانەوە دەردەچوون. ناڵینەکان بچوك بوون، بەڵام زۆر قوڵ بوون؛ جەرگیان دەکرد بەئاو. منداڵەکە لەوەدا بوو پاشەوپاش بگەڕێتەوە، بەڵام ئازایەتی خۆی کۆکردەوە و پاڵی بە دەرگاکەوە ناو چووە ناو سێبەرە ساردەکانەوە، کە بە نەرمی دەستی لێدەدان، وەك ئەوەی دەستانێك بن لە جەلاتینی رەش، تا گەشتە ئەو شوێنەی سێبەری کچەکەی لێیە. کوڕەکە سێبەری کچەکەی بەدەست گرت و سێبەرەکەش لێگەڕا وەك جەستەیەکی لەهۆش چوو، لەدەستیدا بێت. دوای ئەوە کوڕە منداڵەکە چووە دەرەوە و بەتاریکییەکەدا رایکرد و لە مێشکیشیدا ئەو بیرۆکەیە دەهات و دەچوو کە بچێت بۆ گۆڕستان تا بەدوای گۆڕی کچەکەدا بگەڕێت و لێگەڕێت سێبەرەکە لە کونی کێلەکەیەوە دزەبکاتە خوارەوە و لەپاڵ جەستەکەدا پشووبدات. گڵۆپی عەمودی شەقامە چۆڵەکە، سێبەری منداڵەکەی لەسەر بیناکان دەنەخشاند. لەوکاتەدا شتێکی سەیر رویدا، ئەویش ئەوەبوو کە سێبەری کچەکە لەدەستی کوڕەکە هاتە دەرەوەو بەدوای دەستی سێبەرەکەیدا گەڕا. کوڕەکەش وەستا و بە حەپەساوییەوە بینی چۆن سیبەری خۆی و کچەکە بەوپەڕی سۆزەوە ماچی یەکدی دەکەن لەسەر دیواری بینایەك و چۆن تێکەڵ بەیەك دەبن و دەبنە یەك سێبەر.

Post revolution poets and writers

ئەحمەدی مەلا

# شاعیران و نووسەرانی دوای ڕاپەڕین

سەردەمی سەردەم

شالاو حەبیبە



# زیهنییەتی دەق لە نێوان دوو جیهاندا

**خوێندنەوەیەك بۆ «کەسێك لێرەوە تێپەڕی» شالاو حەبیبە.**

## ئەحمەدی مەلا

**«قسەی ئینسان لە نێو بەتاڵیدا دەنگ ناداتەوە.» پۆل کلۆدێل**

یەکەم : تەکنیکی نووسین

ئەگەر سەیری بنەمای کۆشیعری «کەسێك لێرەوە تێپەڕی، شالاو حەبیبە» بکەین، یەکسەر سەرنجی ئەوە دەدەین کە ناونیشانی ئەم کتێبە، وەکو ناونیشانەکانی دیکەیە، واتە لە دوو بڕگە پێکهاتووە. هەشت ناونیشانی بنەڕەتی، لە پاڵ ناونیشانەکەی سەرەوە دەبنە نۆ. ناونیشانی یەکەم هەشت ناونیشانە ناوەکییەکە دەگرێتە خۆی و ئەوانیش هەر یەکە و لە بیست و حەوت بڕگە شیعرییەوە تا سی و پێنجیان لە خۆ گرتووە، دەگرنە خۆ.

ئەمجۆرە داڕشتنە بە بوکەشووشەی رووسی دەچێت، یەکەم دەکەیتەوە، یەکێکی دی تیایە و دووەم دەکەیتەوە سێیەم و بەمجۆرە شالاو حەبیبە گرینگی بە تەکنیکی ڕێکخستنی دەقەکانی داوە. خێرا تێدەگەین هەندەی زەین لە



دارِشتنی ئەم دەقانە بەشدارە، هەندە
پەڕەمووچ رچەکانی عەفەوییەتی
نەگرتووە.
واتە شاعیر گرینگی بە بنەمای
کتێبەکەی داوە.
«کەسێك لێرەوە تێپەڕی» ئاماژە
بۆ رابردوو دەکات، رابردوویەك کە
جوڵەیەکی تێدا رووی داوە و ئێستا ئێمە
تا رادەیەك بەرامبەر بە تابلۆیەکی
ئەبستراکتین. بەرگی کتێبەکە
گوزارشت لەو حاڵەتە شیعرییە دەکات.
یەکێك هات و رۆیشت. ئەگەر هاتن
رووناکی بێت، دیارە رۆیشتن دەبێتە
تاریکی. ئەم کۆنتراستەش دیسانەوە
لە بەرگی کتێبەکە بە روونی دیارە.
کەواتە نابێت چاوەڕێی هیچ سودفە و
رێکەوتێك بین! گەمە لە نێوان هاتن
و چوون، گەمە لە نێوان رووناکی و
تاریکی، گەمە لە نێوان دوو بڕگە...
ئەم دوو دیوە سەرجەم دەقە
شیعرییەکانی شاڵاوی رێکخستووە.
ئەگەریش بە وردی سەیری دەقەکان
بکەین. ئەوانیش دیسان، بە شێوەیەکی
گشتی لە دوو بەرە پێکهاتوون، لە دوو
لایەن، وەکو دیالۆگی شانۆگەرییەك
وایە، یەکێك قسەیەك دەکات، یەکێکی
دیکە وەڵام دەداتەوە. واتە ئێمە
بەرامبەر بە «ریپلیکی» شانۆنامەیەکداین. دیسانەوە
جۆرە گەمەیەك لە نێوان تاریکی و رووناکی بەدی
دەکرێت. مانەوەی هەموو پرسیارێکی بێ وەڵامیش
مانەوەیەکە لە نێوان گومان و رارایی، بۆیە
وەڵامێکمان دەسگیر دەبێت.
بەڵام نابێت ئێمە ئەوەمان لە یاد بچێت
کە نە لە شانۆنامەداین، نە لە نێو پرسیار
و وەڵامی لۆژیکی رۆژانە داین، ئێمە
رۆچووینەتە نێو دونیای شیعر. واتە لە نێو
گوتارێکی دیکەین، کە هەست و فیکرە،
مۆسیقا و بێدەنگی، ئاماژە و پرسیارکردن،
خۆدزینەوە و هەڵاتن دەبنە رەگەزەکانی ئەم
گوتارە.
ناونیشانی یەکەم «یەکەم رۆژی دونیا/
ملوانکەکەی دایکم»، ناونیشانی دووەمیش
«پڵینگی ناو بەتانییە کۆنەکان/پرسەی
مێروولە»، ناونیشانی پێنجەم « هەنارێك
درزی برد/ سوهراب لێرە نییە» هتد.
دەبینین ناونیشانەکان وەکو ناونیشانی
کتێبەکە لە دوو بڕگە پێکهاتوون. ئەگەر
گریمانی ئەوە بکەین کە دەنگی یەکەم
شتێکمان بچرپێنێتە بناگوێ و وەکو پرسیارێك
دایڕێژین: «پڵینگی ناو بەتانییە کۆنەکان؟ ئەوە
وەڵامی «پرسەی مێروولە»مان دەسگیر دەبێت
و ئیتر بەمشێوەیە...
ئەمە یەکێکە لەو کلیلانەی کە لە رێگایەوە
دەتوانین پەی بەرینە دونیای ئەم شاعیرەوە.



دەنگێکە دوای وێرانەیەکی کۆمپلێتەوە دێت. ئەم وێرانەیە مێژووی ئێمە پێکدەهێنێت. مێژوو بە «میم»ێکە گەورە دەبێت بنووسرێت کە سەرجەم چالاکییە کەلتووری و سیاسی و هونەری هتد دەگرێتە خۆ. مەبەستم لە وێرانەی «بەکەرەسەکردنی شیعرە» کە سەدە و نیوێك دەخایەنێت. کێشە کۆمەڵایەتییەکان، کێشە سیاسییە لەبننەهاتووەکان، کێشە نەتەوەییەکان و بگرە کێشە ئاینی و زمانەوانییەکانیش خرابووە ئەستۆی شیعر. شیعر ئەو ئەسپە بارهەڵگرە بوو، دەبوو هەموو کێشەکان راکێشێت!
باسی وێرانە دەکەم چونکە لە نێو دەقی کوردی هەندەی گوێمان لە هاوار و گازندە بووە، هەندە بە گوێی ناخ، گوێمان لە رامان نەبوو، هەندە گوێمان لە داخوازی بووە، هەندە نیگامان بەر پزیسیکێکی خۆڕایی نەکەوتووە تا هەوڵی ئەوە بدەین دەستی بەسەردا بگرین و بیشعرێنین. واتە بیکەینە زیندانییەك کە ژیانمان بداتێ. چونکە حەپسکردنی هەموو هەموو وشەیەك لەسەر کاغەز، زیندانییەکی ئازادە، درێژکراوەی خۆمانە.

دووەم : خوێندنەوە

«ئەم دێرە تەنەکەی زبڵ نییە/ سێوی سەفەر»
ئەو هێڵە لارەم داناوە بۆ ئەوەی بە خوێنەر بڵێم بەشی دووەم لە خوارەوە نووسراوە. هەمان دەنگ دووبارە دەبێتەوە. بە رستەیەکی سەرسوڕهێنەر پێمان دەڵێ «هۆ، ئەم دێرە تەنەکەی زبڵ نییە، بەڵکو سێوی سەفەرە!» سەرەڕای ئەوە وشەی



«سێو» لە دوو ناونێشان دووبارە بۆتەوە، بەڵام ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە، وشە لە شیعردا دووبارە نابنەوە. هەر وشەیەك سەربەخۆیە و دەبێتە موڵکی ئەو دەقەی کە تیایدا نیشتەجێیە.
هەموو ئاماژەکانی «تەنەکەی زبڵ» و «سێو» دەخوێنیەوە. یەکەمیان ئاماژە بۆ شار دەکات، بۆ مانەوە، بۆ نیشتەجێبوون، بۆ داکەوتن، تەنانەت بۆ بۆگەنی و خاشاکیش دەگرێتەوە، کەچی بەشی دووەهەمیشیان سەفەرێکە بۆ باوەشی سرووشت، بەڵام هەموو سروشتێکیش نا، چونکە سێو، ئەم میوە ترسناکەیە کە لە هەموو لەحزەیەکدا بۆی هەیە وەکو مینێك بە رووماندا بتەقێتەوە.
دوو بڕگە: دونیای ستاتیك/دونیای هێمن و پڕ مەترسی.
هەر لە ژێر ئەم ناونیشانە، لە لاپەڕە ١٢٢ دەقێك دەخوێنینەوە بە ناونیشانی «خوێندنەوە» کە ئەمەی لای خوارەوەیە :
خوێندنەوە
هەیە کتێبەکەی دادەخا،
ژنەکەی پێی ناڵێ :
ساڵێك و دوو مانگە لە کوێ بووی ؟!

ئەم دەقە کورتانە، ئەگەر سێبەرێکی هایکۆی یابانیشیان بەسەرەوە بێ، بەڵام گوێڕایەڵی کۆدەکانی ئەو شیعرە کورتانە نین، بەڵکو



لاسایی شیکلی پێوە دیار نییە، بەڵکو تەکنیکی خۆی هێناوەتە کایەوە. (هایکۆ یابانی لە شیعرێکی کورت پێکدێت کە بە شێویەکی شاقوڵی، لەسەر یەك هێڵ دەنووسرێت لە سێ بەش پێکدێت، ٥/٧/٥ برگەیە. نموونە: (لە زەڵکاوە دێرینەکە/ بۆقێك باز دەدات/ دەنگی ئاو). بە زمانی یابانی بەمجۆرەیە

فورویکە یا (٥)

کامازو تۆبیکۆمۆ(٧)

میزو نۆ ئۆتۆ(٥) )

دێینەوە سەر شانۆ، ریپلیکێکی گریمانە لە نێوان ژن و مێردێك دروست بووە. پرسیارێك بە بێ وەڵام ماوەتەوە.

لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ سێو و سرووشت و سەفەر کرد، لێرە بە جۆرێك لە جۆرەکان دووپات دەبنەوە. داخستنی کتێب گەڕانەوەیەك بۆ ژیانی رۆژانە، بۆ شار، بۆ دووپاتبوونەوە، کەچی خوێندنەوە ئەو سەفەرە ترسناکەیە کە شاعیر پرسیاری لێوە دەورووژێنێ.

ئاماژەکردن بۆ دەرەوە، بۆ فەزایەکی فراوانتر، تەنانەت بە دونیایەکی بێ سنوور لەم دەقەی خوارەوە (لاپەڕە ١٤٣) بەرجەستە بووە:

فڕگە

کۆلارەیەك

لە دڵمدا نیشتۆتەوە،

منداڵێك

لەو دەشتاییانە دەگری.

دیسانەوە شالاو حەبیبە بەردوامە لە بەکارهێنانی دوو لایەن، دوو دونیا، دوو کردە، دوو بەرە، بێگومان لە پەیوەندیدان، بەڵام ئەم پەیوەندییانە پچڕاون، تێکشکاون، نەماون، ئاوابوونە، بۆیە شیعر لە دایکدەبێت. دەبێ سەرنجی خوێنەر بۆ شتێك رابکێشین، ئەویش هۆکاری نووسینی شیعرمان لەلا ئاشکرادەبێت. پەی بردن بە تەکنیکی نووسین، پەی بردنە نێو لۆچ و جیهانە پەنهانەکانی نووسەر و هۆ و سەبەبەکانی نووسینمان لە لای ئاشکرا دەکەن، هەر نەبێت داوەتێکە بۆ ناسینی رەگەزێك لە رەگەزەکانی.

کۆلارە و شینایی ئاسمان و بەرەلاکردنی خەیاڵ جیهانێکی کۆمپلێتە، بە تایبەتی لە جیهانی منداڵانی لای ئێمە. بەڵام شالاو زۆر شاعیرانە پێمان دەڵێ، ئەم دیمەنە کۆتایی هات، دەزووی کۆلارە قرتا، بەڵام ئا ئەوەتا لە دڵی مندا نیشتۆتەوە. بەڵام بەچی دەچێ، ژیان تەنها لە هەوارەکانی دڵدا بەرقەرار بێت! ئەو کونجە تاریکە بەس نییە بۆ ژیان، بۆیە «منداڵێك لەو دەشتاییانە دەگری.»

ئاوڕدانەوەیەك بۆ منداڵی، بەڵام ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی پێمان بڵێ منداڵی نامرێ و لە دڵدایە!

ئەم دوو جیهانە دوور لەیەکە لە لای شاعیر بەردەوامە. شیعر ئەم دوو جیهانە لێکترازاوە پێکەوە گرێ دەدات.

لە دەقی «پەیژە لاپەڕە ١٦٣) دەڵێت

بە بێ پەیژە
دابەزیوەتە ناو کۆڵان
شەوی خامۆش.

تێکئالانی سروشت و کۆڵان، بە بێ ئەرك و تەکلیف شەو ئاوێزانی کۆڵان دەبێت. دەڵێی سروشت، لێرە تاریکیی و شەوێکی هێمنە، وەکو مارێك، بەڵام دۆستانە لە باوەشی کۆڵان دەنوێت.

پێچەوانەی ئەم دەقەی سەرەوە دەقێکی دیکە هەیە دەڵێت ( لاپەڕە ١٧٧)

پاسەوان

پەردەکە جوان دەپشکنم،
ژنەکەم نوستووە
ناهێڵم هەتاو بانگی بکا.



بەرامبەر بە شەوی خامۆش، هەتاومان هەیە، هەتاوی کوردستان گەمە لە گەڵ کەس ناکات، بەڵکو حەشەریانە سوار ئەستۆی داروديوار دەبێت. رۆ دەچێتە نێو دیوار و تەنانەت لە سەر سێبەرەکانیش مۆڵگەی خۆی دادەنێت.

بە پێویست دەزانرێت ئاماژە بۆ خاڵێکی زۆر جەوهەری بکرێت ئەویش تێکشکاندنی لۆژێکەکانی نێوان عاشق و مەعشوقە، ئەم هاوکێشەیە تاکو ئێستاش وەکو بارستاییەك، زۆرجار رەزای دەقە شیعرییەکانی ئێمەی قورس کردووە. وەکو ئەوەی عەشق تەنها لە هەوارە نەزۆکەکاندا لە دایکبووبێت، لە دابڕان و نوزانەوە و لالانەوەوە پەیدا بووبێت. بە کورتی شیعری خۆشەویستی کوردی، شیعری دابڕان و هەناسەساردییە؛ دەگمەن، رەنگە زۆریش بە دەگمەن دەقی پێکگەیشتن بێت. لە لۆژێکی عەقڵیی لە لای ئێمە، پێکگەیشتن هەموو ئاسەوارەکانی عەشق دەسڕێتەوە.

خوشەویستی دەبێ بە پاکیزەیی گۆڕبەگۆڕ بکرێت، لە لەحزە دابڕاوەکاندا کۆتایی بێت، ببێتە مەلحەمە هەتاهەتاییەکان و چاوەڕیی رۆژی حەشر بین بۆ ئەوەی عاشق و مەعشوق دەست لە مل بکەن. سەرەڕای ئەمە جیهانبیننە زۆر رۆمانسییە، بەڵکو



نەزۆکیشە زۆرجار.
ئەم گەمەیە کە شالاو لە نێوان رووناکی و تاریکی دەیکات، گەمەیەکی بە پیتە، گەمەیەکی شیعرییە بە ئیمتیاز.

سێیەم : پەیوەندی نالۆژیکەکان
زانست و ماتماتیك بە تایبەندی لە سەر پەیوەندییە رووتەکان ئیش دەکەن، واتە نیو پێوەری تێدانییە، ژمارەکان خۆیان دەدوێن و بە شێوەیەکی بابەتییانە بۆ دوو کەس یا زیاتر دەردەکەون. بەرامبەر بەمە، پەیوەندی شیعری خۆی دەردەخات، نالۆژیك لە شیعردا بە واتای کاۆس و فەوزا نییە، پاشەگەردانییەك نییە سنووری نەبێت و ئەوسەری دیار نەبێت، بەڵکو رەگەزەکان سەرلەنوێ رێکدەخاتەوە و لۆژیکی ناوەکیان دەردەخات. دیاردەکان لە ژێرەوە ئیش دەکەن، لە نهۆمە پەنهانەکان و رایەڵ و داوەکانیان پێکەوە گرێ دەدەن.
یەکێك لە خەوشەکانی شیعری کوردی، هەڵبەتە بەشێك لەو شیعرە، خاوەن قاوغە، واتە بنەمایەکی دەرەکی هەیە پێش ئەوەی بە ناوەڕۆك پڕ کرابێتەوە، هەیکەلێکی ئیسقانی هەیە، پێش ئەوەی بە دەمارو ماسولکە و خوێن پڕ کرابێتەوە. ئەم تەواو دژ بە واتاکانی شیعری ئازاد ئیش دەکات، شیعری ئازاد نە قاوغێکی دیاریکراوی هەیە کە پێشوەخت ئامادەکرابێت، نە ناوەڕۆك و تێمێکی دیاریکراویشی هەیە، بۆیە پێی دەوترێت ئازاد، هەموو دەقێك خۆی داهێنەری شیکل و واتاکانێتی.
ئەم بۆچوونە بە نیسبەت وشەوەش راستە. وشەی فەرهەنگی نییە و لە هەموو دەقێکدا، هەر وەکو ئەوەی فەرهەنگ بۆمانی روون دەکاتەوە، خۆی فەرز کات، بەڵکو وشە، شیعر دروستی دەکات، ئەو دەبێتە سەروەر بە سەر وشەوە. وشە لە کۆتێکست و سیاقی تایبەتی خۆیدا، کۆواتاکان دەداتە دەستەوە. ئەویش لە رێگای ئاواز و بارستایی وشە و سەرجەم ئەو پەیوەندییانەی کە لە رێگای دەقێکی شیعرییەوە دروست دەبن.
بۆ نموونە  لە شیعری «ئەوانی دیکە کوان؟»

دایکم، ملوانکەکەی پچڕا
دەنکێك کەوتە دڵی منەوە.

لێرە سێ ڕەگەز هەن ؛ دایك، ملوانكە، دڵ. لێرەدا لۆژیكی نێوان ئەم سێ ڕەگەزە زۆر ڕوونە، لە لایەك پەیوەندی لە نێوان ملوانكە و دایك و لە لایەكی دیكەشەوە دڵی قسەكەر، شیعرنووس. ئەوەی ویستویێتی نەفەسێكی شعری بداتە ئەم دەقە، تەنها «كەوتنی دەنكێكە بۆ ناو دڵی «من» شیعر نووس. بە ڕای ئێمە ئەم پەیوەندییە لە ئاستێكی زۆر پەنهان دروست نەبووە، جگە لەوەی وێرگوڵ لە دوای وشەی دایك، گرێیەكی ڕێزمانی دروستكردووە. چونكە ئەگەر «دایك» لێرە بانگهێش نەكراو بێت، ئەوە هۆكات بۆ دانانی ئەو وێرگوڵە نییە. دەبوایە ویرگوڵ لەو دێرە هەڵگیرابایەوە. ئەگەر لە جیاتی ئێستێكیش دانرابێت، ئەوە ئەو كات دەكرا بە ماوەیەكی سپی یا سێ و چوار خاڵ ئەو ئێستە دیاری بكرابایە.

گرفتی خاڵبەندی لەم كۆشیعرە بە لایەن منەوە جۆرە خەلەلێكی دروستكردووە. (؛) خاڵ لە ژێر وێرگوڵ دادەنرێت لە ڕستەیەكی درێژدا كە بە ڕستەیەك، بەشێكی ڕستەكەی مانایەكی تەواو بدات بە دەستەوە.

ئێوارە
لە سەر كراسی تەنكی زەریا ؛
هەتاو، پەلەقاژەیەتی.

لەم وێنەیە ڕەگەزەكان زیاترن. كراس، تەنك، زەریا، هەتاو، پەلەقاژە. گواستنەوەی پەیوەندییە نالۆژیكییەكان بۆ لۆژیكی شیعر. ئەوەی جێگای سەرنجەو ئەوەی ئەم وێنەی دەوڵەمەند كردووە، ئەویش كرداری «لەرزینە». لە هەموو لایەك، بە بێ ئەوەی ئەم وشەیەمان لەبەرچاو بێت، هەست بە لەرزینەوە دەكەین.



كراسی تەنك دەلەرێتەوە، زەریا و سەرجەم شەپۆلە ورد و درشتەكانی دەلەرنەوە، ڕەنگدانەوەی هەتاو لەسەر ئەو ڕووبەرە و بە تایبەتی ڕاناوی «پەلەقاژەیەتی» ئەم لەرینەوە و هەڵلەرزینە دەبەخشێتە سەرجەم ئەو ڕەگەزانە. ناونیشانی شیعرەكەش «ئێوارە»یە، هەندەی دیكە دیمەنەكە دەخاتە بەردەم بورانەوە و لە ناوچوون. بە ئاوابوونی هەتاو دیمەنەكە نوقمی ئاوەكە دەبێت. وەكو ناونیشانی كتێبەكە، لە بەرامبەر چركەسات داماندەنێت، گرتنی فۆتۆی ئەو لەحزە سركانە كە یەكێكە لە ڕەگەزەكانی شیعری هایكۆی یابانی، بەڵام...
سەرباری ئەوەی ئەم وێنە شیعرییە  وەكو ئەوەی دەستوری هایكۆ داوامان لێدەكات، ١٧ بڕگەیە، بەڵام دابەشبوونەكە بە هەمان دەستوور ئەنجام نەدراوە و دەكرێت بوترێت شاڵاو هایكۆ نانووسێت لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە: هایكۆ وەسفی دیمەنێك ناكات، هەروەها «من»ی



شاعیر تەواو دەبێ ون بێت، واتە «م» راناوی کەسی یەکەم دەبێ وجوودی نەبێت، گوزارشت لە هەستێکی دیاریکراو دەکات و کتوپڕێتی پێوەدیارە، وەکو فۆتۆی پۆلۆراید. هەروەها دەبێ رەگەزی وەرزێك یا ئاماژەیەکی روونی تێدابێت بۆ سروشت.
ئەم دەستوورانە بە هیچ جۆرێك لەم شیعرە کورتانە پەیڕەوی نەکراون بۆ ئەوەی ئەم دەقانە بدرێنە پاڵ هایکۆ، بەڵام کورتی و گرتنەبەری هەندێ رەگەز ئەو ئیبتیباعەمان لە لای دروست دەکات. دەکرێ بڵێن لەسەر زیهنییەتی هایۆکۆ نووسراون.
لە دەقی «بۆ نائومێدان» تەواو هاوکێشە فیزیاییەکەی سروشت قڵپودیو دەرکرێت. هەمووومان، ئەوە دەزانین کە زەمین شوێنێکی جێگیر نییە، ئەو بە دەوری هەتاودا دەگەڕێ، هەتاویش خاوەن شۆڕشە ئاگرینە لە بننەهاتووەکانێتی، بەڵام جێگیرە.
ئەم دیاردەیە بە بێ ئەوەی گالیلۆش روونی بکاتەوە هەر وابووە، بۆیە لە بڕیارەکەی پەشیمان دەبێتەوە و خۆی لە پەتی سێدارە قوتار دەکات؛ چونکە بڕوای وابوو ژیانی ئەو گرینگترە لەوەی کە کامیان بە دەور کامیان بسوڕێنەوە و بە بێ ئەویش زەمین لە سوڕانەوەی خۆی ناکەوێت!
پیرە هەتاو
بە بینینی ئەم کێوانە
نالەرزێ.

ئەم وێنەیە هەندێ وێنەی کتێبە ئاینییەکانمان دەخاتەوە یاد. مەبەستم سەرجەم ئەو لێکدانەوانەی کە دەکەونە پێش قۆناغی زانستەوە. هەتاو پیرترە لە زەمین؟ یا بە پێچەوانەوە؟ یا هەموو وەکو تەمەنی تەقینەوە مەزنەکە پیرن؟ ئەمەش پرسیارێکە. کێو وەکو بزمار وان کە زەمینیان پێ چەسپکراوە. ئەم رەگەزە کۆسمۆسانە لە لای شاڵاو، گەڕاونەتەوە چاخە سەرەتاییەکان. ئینسانی واقوڕماو بەرامبەر هەموو دیاردەیەکی سروشتی. بروسکە و باران و رەشەبا هتد. دەکرێ ئاماژە بۆ دروستبوونی پەیوەندییەکی سەرەتایی بکەین. پەیوەندییەکی شیعرییە، بۆیە کتێبە دێرینەکان پڕن لە توخمی شیعری، چونکە بە شێوەیەکی منداڵانە لە دونیا راماون.
شیعر دەیەوێ زانیارییەکان بسڕێتەوە و خۆی بسەپێنێت.

چوارەم : هەرەسهێنانی باراستاییەکان

شیعری دوای راپەڕین جۆرە هەڵسانەوەیەکی واقوڕمانەوەیە. خۆی لە دونیایەکی نوێ دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەدەواتی نوێی پێ نییە، ئازادییەك بەرقەرارە، بەڵام تەماح و ویستەکانی ئەو نەوەیە دابین ناکات. لەو جیهانە نوێیە کەلێنێك هەیە بە ئاسانی پڕ نابێتەوە. بەڵام دەبێتە بەرهەمهێنەری شیعرێك کە خۆی لە بارستاییە ئایدیۆلۆژییەکان تا رادەیەك پاکژکردۆتەوە. (بەڵام بە تەقینەوەی سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەناسرێ.)

ئەگەر لێرەو لەوێ هێشتا هەندێ خڵتە بە ژێر مەلاشووی شیعرەوە مابێت، بەڵام ئیتر دەق مەتڵەبخواز نییە، ئیشی نەقابی ناکات، ناچێتە سەر مینبەر و کاری هۆشیارکردنەوە نابینی، لە نامێلکەی نهێنی و بە ناوی خوازراوەوە دەستاودەست ناکات، بەڵکو رامانێکی نوێ دێتە ئاراوە، رامان لە زمان، رامان لە سەرجەم ئەو دەقانەی کە لە پێشخۆی نووسراون و لە رێگای تەکنۆلۆژی زانیاری نوێیەوە، خوێندنەوەی ئەویتری دووردەست کارێکی رەهایە.

یەکێك لە رەگەزەکانی شیعری دوای راپەڕین، سەرهەڵدانی «من»ی شاعیرە، بە هەموو لاوازی و کەموکوڕییەکانییەوە دەیەوێ بڵێ «منیش هەم». خاڵێکی تەندروست، بەڵام بۆ نووسینەوە شیعر بەس نییە، سەرباری ئەمەش وەکو خاڵی دەسپێك، وەرچەرخانێکی گرینگە.

تەنها ناونیشانەکان ئاماژەیەکی روونن بۆ رۆڵی کەس و رۆڵی تاك، ئیتر دەق دەیەوێ گوزارشت لە رۆحی تاك بکات وەك ئەوەی لە لای شاعیرانی شەست و حەفتاکانی سەدەی رابردوو هەوڵێك بوو بۆ نووسینەوەی رۆحی میللەت، ئاوێتەبوونێکی ئەفسووناوی نێوان شاعیر و خاك بوو.

«کەسێك لێرە تێپەڕی» دەسنیشانکردنی رەوتی ئەو تاکەیە، تاکێك دەڵێ «من لێرەم و ئێستاش لێرەم». بۆیە بە رای من ئاسۆی شیعری کوردی لە رابردووەکەی زۆر گەشتر دەبێ، چونکە چیتر ئایدیۆلۆژیا بە هەموو رەنگەکانییەوە ناتوانێت سواری ئەستۆی دەق بێت و سەفەرێکی پێ بکات کە ئارەزوو و خواستی ئەو نەبێت. شوێن تەنها نیشتیمان نییە، بەڵکو ئەو شوێنەیە کە شاعیر تیای نیشتەجێیە، خەون تەنها بە ئازادییەوە نابینرێت، بەڵکو لەو فەزا تەسکەی کە شاعیر دەیەوێ شوێنی خۆی بکاتەوە، هەوڵی ممارەسەکردنی ئەو ئازادییە بدات. شیعرێکی «من» بە ئیمتیاز تیایدا رەنگ دەداتەوە.

راناوی «م» لە زۆربەی هەرە زۆری کۆپلەکان دووپات دەبنەوە و هەندێجاریش «تۆ»یەك دێتە ئاراوە کە گوزارشت لە دوو کەس دەکات. جێی ئاماژەپێکردنە کە «ئەو»ی مەعشوق ئەو کائینە دووردەستە نییە کە رۆمانسییەتێکی برینگی بەخشیبووی بە دەقی کوردی، بەڵکو «تۆ»یك دێتە ئاراوە کە رۆڵی گرێدان و تەنانەت دیالۆگیش دەبینی.



شیعری شالاو وردبوونەوەیە لە شتەکانی بوون، لە شتە هەرە سادەکانەوە بۆ شتە ئاڵۆزەکان.
موفرەدەی شیعر ئەو وشە زەبەلاحە نییە ئیتر دەبێ لە فەرهەنگدا بە دوای بگەڕێین، بەڵکو ئەو وشانەن کە هەموو ڕۆژ بەکاریان دەهێنین.
شیعری نوێی کوردی دەیەوێ پەنجە لە شتەکان بدات، ئەزموونی دونیا بکات و خۆی لە زیهنییەت دوور بخاتەوە. چیتر نایەوێ بەرامبەر بە باخچەکان ڕاوەستێت و گۆرانی بۆ گوڵ و پەپوولە بچڕێت. بەڵکو دەیەوێ گوڵێك بگرێتە دەست و پەپوولەیەك بخاتە ژێر میکرۆسکۆبەوە. ڕەنگە دەقی شالاو بیەوێت ماڵئاوایی لە ڕۆمانسییەت بکات و بڵێ :
«دەستم لە تەماشای گوڵان شوشتووە.»
یا
«ژنەکەی وەڵامی ناداتەوە،
گوڵدانەکە دەکێشێ بە زەیدا.»



Ontology of silence

# ئەنتەلۆگیای بێدەنگی

بۆ ئەبێت ئێمە بێدەنگ بین؟ ئەی بۆ نەبین؟!
ئایە کام لە بیدەنگی باشە و کامە خراپە؟ چەندە
بێدەنگی ماناکانی لە کلتور و دین و ئایدۆلۆژیاوە
هێناوە؟ ئایە ڕۆشنبیریی چەندە ئەتوانێت کۆدی ئەو
مانایانە هەڵبوەشێنێتەوە کە بێدەنگی توانیویەتی
ئینسانەکان لە ناو کۆمەڵگادا گیرۆدە و ماڵی بکات بە
مەبەست گەلێکی دیاریکراو. کەوایە ئەبێت بێدەنگی
لەناو هەموو ئەم مانا جیاواز و شێوازە جیاوازانەی
ژیاندا چی بێت؟ ئەم ئەنتۆلۆگیایە هی هەموو ئەو
کەسانەیە کە لەم گۆشەیەدا باس لە تێگەیشتنی
خۆیان بۆ بێدەنگی و بێدەنگی خودی خۆیان ئەکەن.
بێدەنگ بن بزانن ئەم کەسانە بە باکگراوندە
ڕۆشنبیرییە جیاوازەکانیانەوە لە ڕێی شکاندنی
بێدەنگییەوە چۆن باسی بێدەنگی ئەکەن.

کاروان کاکەسور
بوشرا کەسنەزانی
دیاری قەرەداغی
ئەحمەدی مەلا
بەختیار حسێن



# لەو کەلتوورانەی دەنگ دەستەڵاتی گەورەی هەیە، نووسین بایەخی نییە

کاروان کاکەسوور/ ڕۆمانووس

کاتێ بێدەنگی و دەنگ وەك دوالیسمێك سەیر دەکەین، هیچ ئەنجامی گرنگ بە دەستەوە نادەین، بەڵام ناشکرێت جیاوازی لەنێوانیاندا نەبینین، کە بە بڕوای من بینینی ئەو جیاوازییە لە بەرژەوەندیی بێدەنگیدایە، بەوەی هەر قووڵبوونەوەیەك لەو چەمکە پەراوێزخراوەدا ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێت تێڕوانینی باو تێبپەڕێنین و بە شێوەی تر لێی بڕوانین. لە زمانی کوردیدا پێشگری (بێ) کە بە مانای (نەبوون) دێت، بە هەر وشەیەکەوە بلکێت، پێچەوانەی دەکاتەوە و ئاماژەی ئەوە دەدات، کە شتێکی نێگەتیڤە وەك لە (بێهێز)، (بێتوانا)، (بێبەهرە) و زۆری تردا دەردەکەوێت، بۆیە وشەی (بێدەنگی) مانای نەبوونی دەنگە، لە کاتێکدا لە زمانی عەرەبی (صمت) و لە ئینگلیزی (Silence) دەگوترێت، کە مانای نەبوونی دەنگ ناگەیەنن. بە هەمان شێوە لە زمانی ئەڵمانی و ئەسکەندەناڤیدا وشەکان پێوەندییان بە دەنگەوە نییە. واتە لە ڕووی ئۆراڵەوە هیچ ئاماژەیەکی نێگەتیڤانە بۆ ئەو چەمکە هەست پێ ناکەین، تاکو پێمان بڵێت (بێدەنگی) بۆیە بێدەنگییە.



چونکە دەنگی نییە وەك ئەوەی لە زمانی ئێمەدا هەیە. لە زمانی کوردیدا جیاوازی لەنێوان (لسان Tongue) و (لغة language) یشدا ناکرێت، لە کاتێکدا ئەو دووانە لای زمانەوانەکان لەوانە لای (سۆسێر) جیاوازن و ئەرکی جیاوازیشیان هەیە. (سۆسێر)، کە بە دامەزرێنەری سیمۆلۆجیا دادەنرێت، پێی وایە زمان بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە و زوبان (Tongue) بەو مەبەستە دایهێناوە تاکەکان بە کاری بهێنن. بەوەدا چەمکی بێدەنگی پێوەندیی بە دەنگ، زمان، زمانی ئاخاوتن و نووسینەوە هەیە، باسێکی قووڵە و لە بواری لینگویستیك و فەلسەفەدا بەردەوام پرسیاری ماندووکەر بووە، بە ڕادەیەك لە (پلاتۆن) و زووترەوە تاکو (دێریدا) و دواتر هەر یەکەی بە شێوەی خۆی ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە سەرکێشە بووەتەوە، تەنانەت لە بواری شێوەکارییشدا بێدەنگی، کە بە ڕەنگی سپی ئاماژەی پێ دەدرێت، بایەخێکی گەورەی

فیکری و ئیستاتیکیی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو بوارەمان نییە بچینە ناو وردەکارییەکانیەوە. کەلتووری کوردی وێنەی هەر کەلتوورێکی دیکەی ترادیشناڵ نەك هەر لە ڕووی زمانەوانییەوە وەك نەبووێك لە بێدەنگی دەڕوانێت، بەڵکو لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە مرۆڤی بێدەنگ بە بوونەوەرێکی دەستەپاچە لە قەڵەم دەدات، بەوەی دەنگ ڕێگای سەرەکییە بۆ خۆگونجاندن لەناو کۆمەڵگادا. دەنگ لایەنە فیزیکییەکەی زمانە، مادام قوڕگ، زوبان، مەڵاشوو، ددان، لێو و شتی تر بەشداریی تێدا دەکەن، بێدەنگییش لایەنە مێتافیزیکیەکەیەتی. ئەگەر وەك (هایدیگەر) پێی لەسەر دادەگرێت مرۆڤ لەنێوان ئەو هەموو بوونەوەر و شتانەی لەناویاندا دەژین، تاکە بوونەوەرە لە توانایدا هەیە لەبارەی (بوون)ەوە پرسیار بکات و لێی تێبگات، ئەوا دەکرێت بڵێین مرۆڤ تاکە بوونەوەریشە دەتوانێت بێدەنگ ببێت و لە بێدەنگیی خۆی تێبگات، مادام بێدەنگی لە سەرچاوەیەکی ڕەسەنە. دەنگ زۆربەی کات ئاڕاستەیە بۆ ئەوانی تر و لەژێر جەبری کۆمەڵێك فاکتەری وەك کۆمەڵایەتی، ئابووری و جیۆگرافیدایە، بۆیە دەشێ دەنگ شتێکی ساختە و شێواو بێت، بەوەی



ڕێگای سەرەکییە بۆ خۆگونجاندنی مرۆڤ لەناو گرووپەکاندا، لە کاتێکدا بێدەنگی دیالۆگی خودە لەگەڵ خۆیدا. دەکرێت بگوترێت بێدەنگی تەعبیر لە بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەکات، بەوەی زیاتر لە دەنگ خاوەنی ئازادییە. بەم شێوەیە بێدەنگی، بە تایبەتی لای داهێنەر، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە (بوون) ێکی ڕەسەن و سەربەخۆی هەیە و نایەوێت وەك (بوون)ی ڕووکەش و ساختە لە خودی خۆی داببڕێت، نەبادا لە پرۆسێسی (بەشتبوون)دا ببێتە بابەت و لە کۆمەڵدا بتوێتەوە. کەواتە بێدەنگی نەگوتنی شت نییە، بەڵکو گوتنی شتە بۆ ئەو خودەی بیر دەکاتەوە و پرسیاری ئۆنتۆلۆجیی هەیە. دەنگ گرنگترین کەناڵی مرۆڤە بۆ پێوەندیکردن و گەیاندنی مەبەستەکانی، بۆیە دەنگ ڕێگای سەرەکیی بەکۆمەڵایەتیکردنیەتی. هەر لەبەر ئەوەیە بایەخی دەنگ لە کەلتووری کوردیدا لەوەدا دەردەکەوێت، کە دەتوانێت جەستەکان لە یەکتر نزیك بکاتەوە.
گردبوونەوەیش خەسڵەتی ئەو کەلتوورانەیە تاکەکانی لە شێوەی گرووپی گەورەدا دەژین و دەستبەرداری بەشێکی زۆری ئازادیی خۆیان دەبن. قسەکەر لە ڕێی دەنگەوە دەیەوێت لە ئاستی ئەوانی تردا خۆی بنوێنێت، بەو مەبەستەی ددان بە بوونیدا بنێن و شوێنی خۆی لە کۆمەڵگا بکاتەوە، لە کاتێکدا بێدەنگی دابڕانە لە زمانی گرووپ، بۆ ئەوەی دنیایەکی دیکە لە ناوەوە پێك بهێنێت. سەیر نییە ئەگەر دەبینین لەو کەلتوورانەی دەنگ دەستەڵاتی گەورەی هەیە، نووسین بایەخی نییە. من سەرنجم داوە ئەو کەلتوورانەی دەنگیان پێ لە



بێدەنگی گرنگترە، کەمترین ئازادی بە جەستە ڕەوا دەبینن. لەو کەلتوورانەدا جەستە بە جلی ئەستوور دادەپۆشرێت و (ڕووتی) وەك (بێدەنگی) بەر نەفرەت دەکەوێت. مرۆڤی دەنگدار تەنیا جەستە دەبینێت و هەموو پرسیارەکانی بە جەستەوە بەندن، بەڵام ڕۆح و فیکر، کە پێوەندییان بە بێدەنگییەوە هەیە، دەکەونە دەرەوەی پرسیارەوە. پرسیارەکانی مرۆڤی دەنگدار لەبارەی جەستەوە پرسیاری ئۆنتۆلۆجی نین، بەڵکو پرسیاری کۆمەڵایەتین، کە کەلتوور لە شێوەی بەها و نۆرمی چەسپاودا بەسەر تاکەکانیدا سەپاندوون. لێرەیشدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان جەستەی نێرینە و جەستەی مێینەدا دەکرێت، بەوەی یەکەمیان تاکو لە تواناددا بێت دەردەخرێت و دووەمیان بە هەموو شێوەیەك دەشاردرێتەوە. بوونی چەك بە شانی پیاوی دەنگدارەوە تەنیا بۆ بەرگری و پارێزگاری لە مافی ڕەوا نییە، بەڵکو بە پلەی یەکەم بۆ دەرخستنی جەستەیەتی. بە مانایەکی تر جەستەی پیاو کاتێ مانا پەیدا دەکات، کە بە نیشانەکانی نێرینە دادەپۆشرێت، کە ئەمە بە دیوەکەی تریدا سڕینەوەی جەستەیە. چەك وەکو گرنگترین نیشانەکانی ئازایەتی و پیاوەتی نەك هەر مافی

دەنگهەڵبڕین بۆ نێرینە مسۆگەر دەکات، بەڵکو ڕێی ئەوەیشی پێ دەدات هێرش بکاتە سەر مرۆڤی بێدەنگ، وەك هەندێ لەو نووسەرانەی لە گردبوونەوەکاندا نمایشی جەستەیان دەکەن و بە دەنگی بەرز نووسەری بێدەنگ دەشکێنن. ئەوە پیاوی دەنگدارە ڕێی ژنی داوە جەستەی بە زێڕ، زیو و شتی ناسکی تر بڕازێنێتەوە، بەو مەبەستەی لەو بەراوردکارییەدا جەستەی زبری خۆی لە چاو جەستەی ناسکی ئەودا زەقتر دەربکەوێت. کاتێکیش دەنگ و جەستە پێوەندیی بەتینیان پێکەوە هەیە، ئەوا جەستەی ناسك بێدەنگ دەبێت و جەستەی زبر دەنگ هەڵدەبڕێت. هەتا ئەو جەستەیە زیاتر خاوەنی نیشانەکانی زبری و پیاوەتی بێت، توانای دەنگهەڵبڕینیشی پتر دەبێت. دەگەینە ئەوەی بڵێین ڕاستە دەم و قوڕگ سەرچاوەی دەنگن، بەڵام ئەوەی ماهییەتی ئەو دەنگە دیاری دەکات کۆمەڵێك نیشانەن، کە کەلتوور وەك سیمبۆلی پیاوەتی و ئازایەتی لێیان دەڕوانێت. کەواتە ئەوەی جێگای پرسیارە بێدەنگی نییە، بەڵکو دەنگە، ڕاستتر دەنگی نێرینە و هێزی دەنگی ئەو نێرینەیەیە. لە کەتووری زارەکیدا، واتە لەو کەلتوورانەی وەك هیی کورد نامێژوویین و خاوەنی دامودەستگای مەدەنی نین، ئەو دەنگانەی لە ڕێی هوتاف و درووشمەوە بۆ سەرکردەکان ئاڕاستە دەکرێن زۆر لەو دەنگانە گرنگترن، کە بە بێدەنگی لە هەڵبژاردنەکاندا بۆیان دەخرێنە سەندووقەوە، بۆیە ئەو دەنگە بێدەنگانە ددانیان پێدا نانرێت و لە ڕێگای دەنگی فیزیکییەوە، واتە لە ڕێی قسەوە کێشەکە یەکلا دەکرێتەوە. بەم شێوەیە بێدەنگی زۆر کەم قسەی لێوە کراوە، یان هەر لێی نەکراوە، چونکە چەمکێکی نەگەتیڤە و چەمکە نەگەتیڤەکانیش، مادام تەنیا لە ڕێی چەمکە پۆزەتیڤەکانەوە دەردەکەون و پاشکۆی ئەوانن، ئەوا بە لاوە دەنرێن، بەوەی کەلتوور دوا بڕیاری لەسەر داون و چوارچێوەی بۆ داڕشتوون. بێدەنگی لە کەلتووری زارەکیدا دوو ڕووی جیاواز پێشان دەدات. کاتێ پێوەندیی بە ژنەوە هەیە بە پۆزەتیڤ دادەنرێت، بەڵام ئەو خەسڵەتە بۆ پیاو نەگەتیڤە، بەوەی هاوواتای شەرم و ترسنۆکییە. سەیر نییە ئەگەر زۆر جار لە بواری نووسیندا نووسەر و ڕۆشنبیری پیاو بەوە تۆمەتبار بکرێن، کە ترسنۆك و شەرمنن، وەك ئەوەی لە حەڤدەی فێبریوەریدا بینیمان چۆن نووسەر



هەبوو نووسەرانی تری بەوە تۆمەتبار دەکرد دەنگیان نەبووە. واتە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوانە بە نووسین بۆچوون و هەڵوێستی خۆیان ڕاگەیاندبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بە شێوەی جەستە دەرنەکەوتبوون و دەنگی فیزیکیی خۆیان دەرنەبڕیبوو، بە ترسنۆك و شەرمن دادەنران. ئەو تۆمەتانە تەنیا دەدرانە پاڵ نووسەری پیاو و نووسەری ژنیان نەدەگرتەوە. دەکرێت دیسان ئەو نموونەیە بیری خۆمان بهێنینەوە، کە ئەو دەنگانەی دەخرێنە سەندووقی هەڵبژاردنەوە چونکە لە دەم دەرناچن و دەنووسرێن، گرنگییان نییە. هەر لێرە لەوەیش تێدەگەین چۆن هەندێك لە نووسەرانی ئێمە بە هەمان ئەقڵی سیاسییەکان دەنگ دەخەنە سەرووی بێدەنگی و نووسینەوە، بگرە لە ڕێگای هاوارەوە هێرش بۆ سەر هەموو نووسەرێکی بێدەنگ دێنن، بێ ئەوەی لە ئاستەکانی بێدەنگی تێبگەن. ئایا بێدەنگیی ڕۆشنبیری داهێنەر هەمان بێدەنگیی ڕۆشنبیری ئاساییە؟ وەك دەبینین لە کەلتووری زارەکیدا نووسین پلەیەکی زۆر کەمتری لە قسە، یان ڕاستتر لە دەنگ هەیە. ئەمە ئەو بوارەیە، کە (دێریدا) بەشێکی زۆری تەمەنی خۆی بۆ تەرخان دەکات و بەپێی میتۆدی هەڵوەشاندنەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. لە کاتێکدا فۆنۆسێنتریزم (**Phonocentrism**)، واتە سێنترالیزمی دەنگ، پێی وایە دەنگ و ئاخاوتن دەکەونە سەرووی زمانی نووسینەوە، یان بە مانایەکی تر ئەوانە لە نووسین گرنگترن، کە ئەمە میراتێکە لە (پلاتۆن)ەوە جێ ماوە و بە (سۆسێر)دا تێپەڕیوە، ئەو فەیلەسووفە شەڕانگێزە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت نووسین دەکەوێتە پێش ئاخاوتن و هاوشانیشیەتی، بگرە لە خۆیشی دەگرێت. بەڵێ، بەپێی ئەو میراتە (دەنگ) وەك (ئامادە) و



(نووسین) وەك (نائامادە) سەیر کراوە، بۆیە (دێریدا) جەخت لەسەر نووسین دەکات و دەیەوێت لەو ڕێگایەوە دەستەڵاتی (دەنگ) تێك بشکێنێت. ئەمە باسێکی قووڵە و لێرە بواری ئەوەمان نییە بچینە ناو وردەکارییەکانیەوە، بەڵام دەبێت ئەوەیش بڵێین (دێریدا) پێی وایە سێنترالیزمی دەنگ هەمیشە لە ئاستی تێکستەکاندا ڕووبەڕووی دوالیزمە دژەکانمان دەکاتەوە وەك ڕۆح/ جەستە، ئەقڵ/ نائەقڵ، قسە/ نووسین، گەرم/ سارد، ڕەش/ سپی، ژیان/ مردن، چاك/ خراپ، جوان/ ناشیرین و زۆری تر، کە مێتافیزیکا لەو ڕێگایەوە مانای پێشوەختی خۆی دەسەپێنێت، مانایەك، وا خۆی دەردەخات قەوارەیەکی یەکگرتوو و هاوڕێکی هەیە و بووەتە سێنترالی ئەقڵ، دواجار لە شێوەی حەقیقەتێکی نەگۆڕدا دەردەکەوێت. بە بڕوای من نووسین بەرهەمی بێدەنگییە، بەڵام نووسین هەمیشە لەگەڵ خۆیدا نیگەرانی بۆ نووسەر دەهێنێت، بەوەی ناتوانێت بە دروستی ئەو وێنانەی ناوەوەی بگوازێتەوە. سەیر نییە ئەگەر کەسی بێدەنگ هەمیشە هەست بکات دنیای بێدەنگی نەك هەر لە دنیای دەنگ گەورەترە، بەڵکو بگاتە



ئەوەی بە دنیای ڕاستەقینەیشی بزانێت، کە هێزێکی گەورەی زمان و دەربڕینی گەرەکە، تاکو وێنەکانی بۆ دەرەوە بگوازێتەوە. بەم شێوەیە بێدەنگی خاوە و دەکرێت بەردەوام کاری پێ بکرێت، بێ ئەوەی لەو دۆخەی خۆی دەربچێت، بەڵام دەنگ کولاّوە و لە دەست دەرچووە، هەر بۆیە وەك گوتمان بێدەنگی ئاڕاستەیەکە بۆ نووسین، بەوەی نووسین جیاوازی دەهێنێتە کایەوە و بێسنوور ئاڕاستەی دیکەی لێ دەبێتەوە. دەکرێت بڵێین کەسی بێدەنگ لە بەرانبەر دنیای ئەوانی تردا داخراو و لە بەرانبەر دنیای خۆیدا کراوەیە، کە (کارل گۆستاڤ یۆنگ) چەمکی (**Introvert**)ی بۆ بە کار دەهێنێت، بەو مانایەی ئەو بێدەنگانە لەناوەوە دنیایەکی گەورە دادەمەزرێنن. دەنگ، کە خۆی خەسڵەتێکی فیزیکیی هەیە، بەوەی قوڕگ، زوبان، مەڵاشوو، ددان، لێو و شتی تر بەشداریی تێدا دەکەن، ئەوا بەر تەنە فیزیکییەکانیش دەکەوێت و دەنگدانەوەی دەبێت، بەڵام بێدەنگی بەر هیچ تەنێکی فیزیکی ناکەوێت. دەنگ زۆربەی کات بۆ گیانلەبەر ئاڕاستە دەکرێت و ئەو گیانلەبەرانە وەڵامدانەوەیان بۆ ئەو دەنگە دەبێت، بەڵام بێدەنگی مادام ئاڕاستەی تەنیا بۆ خۆیەتی، ئەوا وەڵام بایەخێکی گەورەی بۆی نابێت. لەمەوە دەزانین داهێنەر خاوەنی هێزێکی گەورەی ناوەوەیە، کە بێ ئەوەی گوێی لە دەنگدانەوەی بۆچوونەکانی ببێت، بەردەوام دەبێت. هەر بەو هێزە گەورەیەیش بەرگەی تێکڕای ئەو هێرشانە دەگرێت، کە دەیانەوێت لەناو بێدەنگییەکەی دەریبهێنن، بەو مەبەستەی وەك هەموو ئەوانی تر لەناو قەرەباڵغییەکاندا دەنگ هەڵبڕێت. کەلتووری ئێمە وزەیەکی گەورە دەخاتە کار لەپێناوی ئەوەی بێدەنگی بۆ دەنگ بگۆڕێت، بەوەی بێدەنگی لادانە لەو بەها و نۆرمانەی کۆمەڵگا لەوەتەی هەیە پارێزگارییان لێ دەکات. بە درێژاییی مێژووی نووسینی ئێمە تێگەیشتنێکی زاڵ هەبووە، کە پێی وا بووە بۆیە دەنووسین، تاکو لە ڕێی زمانەوە دەنگ هەڵببڕین، بەڵام ڕاستییەکەی نووسین بە پلەی یەکەم لەوەدا فریامان دەکەوێت پارێزگاری لە بێدەنگیی خۆمان بکەین، چونکە بێدەنگی بێجگە لە زمانی خۆی، کە زمانی ئۆنتۆلۆجییە، بە هیچ زمانێکی تر دەرنابڕێت. سەیر نییە ئەگەر مێژووی فەلسەفە مێژووی بێدەنگی بوویێت. لەناو بێدەنگیی داهێنەراندا بێدەنگیی (دێکارت) لە فەلسەفە و هیی (کافکا) لە ئەدەبدا دەگمەنە.



# بێدەنگ بن جەنەراڵ ڕەحەت دەبێت!

بوشرا کەسنەزان/ ڕەخنەگر



کاتێك گەشتمە ئەم ڕستەیەی ناو ڕۆمانەکەی پاییزی باوکسالاریی مارکیز، بۆ ساتێك هەوڵم دا بێدەنگ بم. بێدەنگ لە ناوەوە، ڕێك لەو شوێنەی کە قوڵایی منە، تا هەست بکەم بێدەنگی چییە؟ بۆ دەبێت سەرتاسەری ناو کۆشك بیدەنگ بن، بۆ ئەو چرکەساتەی کە جەنەڕال دەیەوێت بگاتە ترۆپك، ئایا بە ڕاستی جەنەراڵ دوور لە چێژ و ئۆرگازم، خۆیشی دەگاتە بێدەنگی؟ هەمووان لە کۆشکدا تەنها دەنگیان دەرنایەت، یان لە شەوق و جۆشی و خرۆشی ناوەوەش دەوەستن؟ بێدەنگی تەنها نەمانی دەنگە؟



یان وەستان و هەڵوێستەکردنە؟ کە بیر لە بێدەنگی دەکەوە، ئەو کاتە کە لە ناوە من خەریکم بە دەنگی بەرز قسە بۆ خۆم دەکەم، ئەمەش ماندووم دەکات، چونکە هەر بەڕاستی من دەمەوێت دەنگەکانی ناوەوەشم بوەستێنم، حەزدەکەم یەکێك فەرمان بکات وەك ناو کۆشکی جەنەڕاڵ تا کۆشکی ناوەوەم سەرتاسەر بێدەنگ بێت، بۆ ئەوەی بگەمە ئەو ئارامییەی کە مەبەستمە، ئارامییەکی تەواو کە هەم ڕەنگی هەیە هەم بۆن. ئارامییەك جیاواز لە کپی، جیاواز لەو بێدەنگییەی لە خەونە کابووس ئامێزەکاندا بەرۆکت دەگرێت، یان لەو کابووسانەی هاواردەکەیت و دەنگت دەرنایەت، بێدەنگییەکم دەوێت، دەنگەکانی ناوەوەم وەستابن لەبەر منی جەنەراڵ!

زۆرجار بیردەکەمەوە لە خودی بێدەنگی، کە تەواو دەنگ نامێنێ، نەمانی دەنگیش بەو واتایەی ئیتر بیرکردنەوەی من ناگات بەوی دی، چونکە لە پرۆسەی گفتوگۆدا، کە بچوکترین غەریزەی مرۆییە، دەنگ و قسە دەبێتە گەیەنەری بیرکردنەوە و خەیاڵ و هزری ئێمە بەوی دی، هەر لە ڕێی دەنگیشەوەیە گفتوگۆ دروست دەبێت. بە هۆی شریتێکی دەنگییەوە زنجیرە بیرەکانی خۆمان بەوی دی دەگەیەنین، ئەگەر ئەم شریتە دەنگییە، لە میانەی پرۆسەی دروست بوونیدا لە ناوەوە ڕاگرین و نەیەڵین گۆ بکرێت، بێدەنگی دروست دەبێت؟ خۆ ئەگەر بێدەنگی بەوەبێت، ئەوا چی لە دەنگەدەنگەکانی ناوەوە دەکەین، کە بیرەکان گینگڵ دەدەن و بە تەوژم خۆیان بە دیوارەکانی ناوەوەماندا دەکێشن؟ یان ئەگەر بێدەنگی بەوە بێت، تەنها دەنگمان نەیەت، نەك بیرەکانیشمان نەگات بەوانی تر ئەی چی لەو مرۆڤانە بکەین، کە دەنگیان دەرنایەت و بیرەکانیشیان دەگەیەنن بەهۆی سیگناڵی نازمانیی و ئاماژەکارییەوە، ئەگەر یەکێك لەوانە قسەمان بۆ بکات بەو زمانی ئاماژەیە، ئێمە بمانەوێت ڕایگرین، دیسانەوە دەڵێین بێدەنگبە!؟ خۆ ئەو دەنگی نەبووە، تا دەنگی ڕاگرین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بێدەنگی بە مانای ئەوە دێت، وشەکان ڕاگرین لەو ڕژانە بەردەوامەی، کە بیرەکان دەهێننە دەر لە گەڵ خۆیاندا، چونکە ئەرکی دەنگ هیچ

نییە گەیاندن نەبێت، لە کاتێکدا ئەرکی گەیاندن لای کەسە تایبەتەکان(لاڵەکان) دەکەوێتە سەر ئاماژە و جوڵەی ئەندامەکانی لەش.
بێدەنگ وەستانی ڕەوانەکردنی بیرەکانە، لێرەشدا بێدەنگی بەو مانایە دیت، کە تەواوی گەیاندنی ناوەوەمان لەوانی دەوروبەرمان مەحروم بکەین و وەك حەساریك خۆمانی پێ گەمارۆ بدەین، دەنگ هەڵنابڕین و لە ناوەوە بیرەکانمان سەر لە نوێ بۆ خۆمان دەخەینەوە ڕوو. لە ناوەوە لەگەڵ خۆمان دەست دەکەین بە گفتوگۆ و هەر لە ناو خۆشماندا سەرزەنشتی خۆمان دەیکەین و لەگەڵ خۆماندا دەیکەین بە دەمەقاڵە، تا ئەوەی خۆمان دەتوانین لە ناوەوە بێ ئەوەی ئەوی دی نامەحرەم پێبزانێت خۆمان بریندار دەکەین. ئەمەش ئەو کاتەیە، کە تەواو لە دەرەوە ئێمە بێدەنگین و لە ناوەوە جەنگ بەرپایە، هەر ئەوەیە وا دەکات بێدەنگی هەمیشە ئارامی نەبێت، بێدەنگی پاکی و جوانی و بە مانا میللییەکەی «شەریفی» نەبێت، چونکە ئەو کاتەی دەنگ ڕادەگیرێت، بیر لە قسەدایە، بەڵگەش بۆ ئەمە زۆرینەی مرۆڤە گۆشەگیر و کەمدوو و لاتەریکەکانن، بەردەوام وەك کەسانی ئارام و بیدەنگ تەماشادەکرێن، لە کاتێکدا ئەدەبیات بەهۆی دەروونشیکارییەوە وێنەی ناوەوەی ئەمانمان بۆ دەکێشێت، ئەگەرچی لە دەرەوە بێدەنگن، بەڵام ئەمە مانای ئارامی ناخ نییە و بەڵگەیە بۆ نەدۆزینەوەی تاکی ناو دوو جەمسەری قسەکەر و گوێگر، بۆیە ئەو تاکە لە ناوەوە دەدۆزێتەوە و خۆی دەبێتە گوێگر و دەبێتە قەسەکەریش، لە ناوەوە بە مۆنۆلۆگ بێ ئەوەی دەنگی بێت بێ ئەوەی سەدا هاتبێتە دەر ئەو خەریکی قسەکردنە!
ئەمەش ڕێك ئەو کاتەیە کە بێدەنگە، بەڵام بێ قسە نییە، بێدەنگی وەستانە و ئەهوەن بوونەوەیە!
کاتێك دەڵێم بێدەنگی شەریفی نییە، بیری فیلمی پێرسۆنای ئینگمار بێرگمانم دەکەوێتەوە، بێرگمان وەك هەمیشە لەم فیلمەدا قسە لەسەر ناوەوەی مرۆڤ دەکات، کاری بەسەر کردارە دەرکییەکانەوە نییە، مەگەر ئەوەی پێت نەڵێت: کە ئەمە ڕەنگدەرەوەی چ کارەسات و غەوغاییەکی ناوەکییە. ئەوەی بێرگمان لەم فیلمەدا بە ناوی پێرسۆنا و دەمامەکەوە نیشانی دەدات، نیشانەی پرسیاردانانە لەسەر ئەو بێدەنگییەی ئێمە زۆرجار بە باشی و جوانی ناوی دەبەین!
کاتێك ئەلیزابیت بڕیار دەدات دوای ئەو هەموو خودنەبوون و ڕۆڵبینینە درۆزنانەیە بێدەنگ بێت و تەواو قسەنەکات، یان بە مانا کوردییەکەی دەنگی نەیەت، تەواو ئەو کاتەیە، کە ئەو تەنها دەنگی بڕیوە وە گەرنا بیرەکانی بە نووسین دەگەیەنێت بە هاوسەرکەی و دیسانەوە خودی بێدەنگیش ناتوانێت بە بەرگی باشی و جوانییەکان داپۆشرێت و ئەو دەمامەکە هەڵدەماڵرێت، کە کراوەتە ڕوو بەناوی ئەوەوە کە بیزارە



**حەزم لە چوونە ناو دارستان هەیە.**
**ئەو بێدەنگییەی لەویادا هەیە**
**سەرریژە لە ئاشتی و ئارامی.**
**سپێدان کاتێک تەمێکی بێدەنگ**
**بەسەر کێڵگە و مەزراکاندا**
**ئەکشێت. یان ڕۆژانی زستان ساتێ**
**ڕووناکییەکی تەزیو بەفر ڕەنگ**
**ئەکات و سنەوبەرەکان تەواو بێ**
**جوڵە و بێدەنگن ئەبن.**

**یۆران پارشۆن**

**سەرۆک وەزیرانی پێشوی سوید**



لە دەمامکی قسەکردن. واتە بێرگمان قسەکردن و ڕۆلبینی ئەکتەرێك بە درۆ و دەمامك دادەنێ. بۆ وازهێنان لەمەش بێدەنگی دەدا بە کارەکتەرەکەی، کە ئەمەش سەر لەنوێ دەمامکێکی ترە بۆ شاردنەوەی ناوەوەی مرۆڤ، ڕێك ئەمە کە بێرگمان ستایشی قسەکردن دەکات و بێدەنگی دەخاتە ژێر پرسیارەوە. کە چۆن لە فیلمی «بێدەنگی»ش دا بێدەنگی تێکدەشکێنێت و هەردوو خوشەکەکە دەکەونە ناو دیالۆگ و هاوار و دەمەقاڵەوە. کە تەواو مرۆڤبوون بە قسە و بەو هاوارانەوە بە ڕاستگۆ و دەروون درووست نیشان دەدات، با قسەکانیش نادرووست بن لە نەکردن باشترن!

ئیستا دوای ئەم دێڕانە بیدەنگم، کەس گوێی لێمە؟!



# وشه بەس لەدەمدا هەڵناگیرێ

دیاری قەرەداغی/ هونەرمەند



پەیوەندییەکی دووانەی دانەبڕاوە لەگەڵ چەمکی جوانیی، تا جوانی زیاتر هەڵکشێ لە بونەوەردا دەم بێدەنگ و ناخ زیاتر دەهەژێ، ئەمەش حەقیقەتێکی هەستپێکراوە و نەچۆتە دەرەوەی وجود، گەرچی گوزارشتە لەجەوهەری ئینسان بەڵام زۆر بە ئاسانی دەتوانین دەستی لێوە بدەین، بەمانای بەرهەمی بیرکردنەوەی مرۆڤە، لە کۆتا قۆناغیدا فرێ نادرێتە دەرەوەی بوون. بۆ پەی بردن بەرۆچوون،(بێدەنگی) هەڵدەبژێردرێ...

**ئەگەر زەوی ئینسان و**
**ئاژەڵی لەسەر نەژیایە ئەوا**
**بێدەنگ ئەبوو.**

**ڤیکتۆر، تەمەن شەش ساڵ**



بۆ منیش بێدەنگی هەموو ئەو هەراو زەنا زۆرەی ناخمە کەبەهیچ جۆرێك کۆتایی نایە و بێدەنگ نابێ، بۆیە دەم نوقانم نیشانە نییە بۆ بێدەنگی، چونکە وشە بەس لەدەمدا هەڵناگیرێ.. کەزانیم وایە بێدەنگ ئەبم.. چونکە بێدەنگی تاکە ڕێگا چارەیەکە، لەنێو ژاوەژاوی دنیا و ئەو جەنجاڵی و هەرایە بە ئەسپایی ئەبمە پەناهەندەی ئەشکەوتی بێدەنگیی، بێدەنگ ئەبم تا گەمارۆی وشە جێهێڵم و لەسنورداریی درکاندن یاخی بم و هێواش هێواش بەناوچەکانی بێدەنگیدا بگەم، ئەو ناوچانەی کەنەسنوور و نەکۆت و نەپێوەندیشی هەن.

باشترە بێدەنگیی؛ وەك لەوەی یەکەم هەنگاوی نادیاری وشە هەڵگرم و بۆ ئەبەد بەدەستیەوە وێڵمکا ، بێدەنگیی شارەزای گشت زمانەکانە و تەواوی ئاسۆ و پانتاییەکان و بەربەستەکان ئەبڕێ، گەرچی بۆ من کوشندەیە بەڵام ئاسانترە لەوەی یەك بار وشە لە کوڵ بنێم، دوواجار بێ بڕیاری پێشوەخت بێدەنگ ئەبم چونکە بەشێك هەن بە ئاگاییەوە پەڕەکانی بێدەنگیم دەخوێننەوە و چرچ و لۆچی نێوچاوانم و بزە و هێمای تووڕەبون و یاخی بوون و ناخم تویکار ئەکەن، هاوکاتیش زۆرێکی تر نایانەوێ بەر ئەم بێدەنگییە کەون نابادا دوو هێندەی ئازاری وشە برینداریانکا.



# بێدەنگی رەگورێشەی لە نێو کەلتوورەکاندا هەیە

ئەحمەدی مەلا/ نووسەر

**ـ بێدەنگی چییە؟**

بێدەنگی کۆمپلێت مردنە و بەرامبەرەکەشی هاتوهاورێکی بێمانایە. کەواتە ئەوەی دەمینێتەوە لەو نێوەندەدا دەکرێ لێی رابمێنین و بیری لێبکەینەوە و قسەی لەسەر بکەین. لە راستیشدا قسەکردن لە سەر بێدەنگی، خۆی لە خۆیدا بێدەنگی دەشکێنێ، بۆیە زەحمەتە ئەم چەمکە بخرێتە دووتۆی رامان و قسەلێکردنەوە. هەموو رامانێك خۆی قسەکردنێکی پەنهانە. بەڵام دەتوانین بڵێین کە بێدەنگی بەرامبەر بە دەنگ دەوەستێت، بە لایەن کەم لە زمانی کوردی. یەکێکە لەو دەستەواژانەی کە کۆواتای هەیە، واتە پولیسیێمێتیکە. دەوترێت «ئینسانێکی بێدەنگە» واتە هێمن و لەسەرخۆیە،



لێرە واتایەکی پۆزەتیڤی هەیە.
دەوترێت «ئەم هەموو بێدەنگییە مانای چییە؟» لێرە بێدەنگی واتایەکی نەرێی هەیە، واتە نێگەتیڤە. بێدەنگی لە رستەیەکدا کاتێ یەکێك قسە دەکات، دەشێت هەڵگری واتا بێت، واتای هەمەچەشن.
بێدەنگی کەلتووریشە، رەگورێشەی لە نێو کەلتوورەکاندا هەیە. لە لای کوردان بێدەنگی خەسڵەتێکی باشە و لە لای هەندێ گرووپی هیندە سوورەکان، تەنانەت قسەکردن بە دەرچوونی بەشێك لە رۆح دەدرێتە قەڵەم، بۆیە بێدەنگی هەڵدەبژێرن.
بێدەنگبوونی سیاسی و نارِوونی و ناهەڵوێستیش هەیە.
بێدەنگی لە هەندێ بارودۆخدا وەکو تاوان سەیر دەکرێت. لە زۆرێك لە کەلتوورەکانی ئەورووپا، دروشمگەلێك بەزردەکرێتەوە کاتێك رووداوێکی دڵتەزێن و ناچیزە روو دەدات، بۆ نموونە، دەوترێت «بێدەنگ! کۆچباران راو دەکەن.»
هەندێ رامانیش هەن کە لە ئاینە ئاساییەکان پەیرِەوی دەکرێت، دەبێ خاوەنەکەی تەواو لە نێو بێدەنگیدا بێت، تەنانەت هزر و هۆشی لەهەموو شتێك بەتاڵ بکات، بگاتە بێدەنگییەکی تەواو.
لە راستیدا بێدەنگی وجوودی نییە، هەموو شتێك دەنگە، تەنانەت ئەگەر  بە تەواوی گوێراهێڵێن، لە کاتی چەکەرەکردنی درەختێك گوێمان لە دەنگ دەبێت، خولانەوەی ئەستێرەکان دەنگن، خودی زەوی لە دەنگێکی مەزن پێکهاتووە، هەناسە دەدات، ملیۆنەها دیاردەی پەنهان و شاراوەی لەسەر روو دەدات، لە  ناواخنی زەمین لە دەنگێکی مەزن هەیە. ژیان و ئینسان واتە دەنگ.
لە کۆتاییدا ئێمە بەرهەمی دەنگین و لە بێدەنگی دەگەرِێن.



- بێدەنگی بۆ تۆ چییە؟

سەختە باس لە بێدەنگی بکەین لە کاتێکدا هەرچییەك بڵێین  دژە بێدەنگیی خۆی دەناسێنێت. لە رووی فەلسەفییەوە، بابەتێکی زۆر بە هەند وەرنەگیراوە، چونکە فەلسەفە لە سەر قسەکردن ئیش دەکات، نەك لە سەر بێدەنگی. دونیا بە قسە دروست دەبێت، چیرۆکی خەلق لە

کۆتاییدا، چیرۆکی قسەکردنە نەك بێدەنگی.  لە ئینجیل دەخوێنینەوە کە لە سەرەتا قسە هەبوو. قسەکردن واتە بەرجەستەبوونی فیکرەیەکی دیاریکراو و رۆحلەبەکردنی بەرجەستە.

من بێدەنگم لەبەر ئەوەی هیچم نییە بیڵێم، ئەمەش هەڵوێستێکە لە دوو تۆی قسەکردنەوە بەهای خۆی دەسگیر دەبێت. رەنگە هەندێجاریش بێدەنگی لە گفتوگۆ زیاتر بارستایی خۆی هەبێت، بەڵام رەنگە بە چاو بێدەنگی بشکێنرێت، چونکە ئاماژە و هێماکانی روخساریش خاوەن رێزمانی خۆیانن، ئەمەش دیسانەوە کەلتوورییە. ( بڕوانە بەرهەمەکانی ئێدوارد هال.)

**بێدەنگی بۆ پیرەمێردێک ئەوکاتەیە کە ژنە چەنابازەکەی ئەخەوێت.**

**یاسەمین،**
**تەمەن سیانزە ساڵ**

من حەزم لە بێدەنگییە، بە داخەوە لە وڵاتێك دەژێم کە لە رووی هەراوهوریاوە، لە دوای ژاپۆنەوە دێت. مەبەستم ئیسپانیایە کە وڵاتی دەنگەدەنگ و هەرا و قسەکردن بە دەنگی بەرز و ئاستی دەنگی تەلەفیزیۆن و رادیۆ و دەنگی سینەما لە هەموو وڵاتانی ئەورووپا بەرزترە. سەرەتا من لۆکەم دەخستە گوێم لە هۆڵی سینەما، چونکە بۆ من دەنگەکەی لە رادەی ئاسایی بەرزتربوو و بەمە رانەهاتبووم. بەڵام خۆشحاڵم لە گوند دەژێم و پشتەوەی ماڵەکەم چۆڵەوانییە، زۆرجار پیاسە دەکەم و گوێم لە قاسپەی کەو دەبێت و تەیروتواڵەکانی ئەم ناوچەیە



زۆر بە تەیروتواڵی لای ئێمە دەکەن، بێدەنگی هەڵدەبژێرم بۆ ئەوەی دەنگەکان بناسمەوە. کاتێك لە ناو بێدەنگی دەبین، گوێمان لە شتی زۆر تایبەت و بەهابەخش دەبێت. فڕینی پەپوولەیەك، مێشێك، لەرینەوەی گەڵایەك، ئەگەر جوان گوێبگرین دەنگی کۆچکردنی هەوریش دەبیستین. من حەز لە بێدەنگی دەگەم بۆ ئەوەی دەنگە راستەقینەکان بدۆزمەوە.

بەقەد ئەوەی حەزم لە دەنگە حەزیشم لە بێدەنگییە، چونکە یەك مانا دەداتە ئەویتر.



# جوانترین ساتەکانی عاشقەکان بێدەنگییە

بەختیار حسین/ مۆسیقار



بێدەنگی بینینە، بینینی ئەو شتانەی کە لە ساتەوەختەکانی ژیانی ئاساییدا نایانبینین، بینینی ئەو ڕەنگانەی کە پێدەچێ هەرگیز نەمان بینیبن، بینینی خۆمان وەك ئەوەی کە هەین و چ پانتاییەکمان هەیە لەم گەردوونە بێ سنوورەدا! بێدەنگی بە سەرەتاکانی بوون و ناسینی خۆمان ئاشنامان دەکات، ئەو سەرەتایانەی کە بەبونیان تێدەگەین کە ئێمە هیچ نازانین و هەمیشەش وێڵین بەدوای زانین و ناسینی ئەو شتانەی کە نایان زانین و نایان ناسین. بێدەنگی ڕەچوونە بە پانتاییەکانی ڕۆحدا. ئە گەر بۆ تاوێك گوێ لە روحمان بگرین ئەوکات تێدەگەین مرۆڤ چەند بوونەوەرێکی باڵایە و

چەندیش دەستەوستانە لە بەرانبەر
بەرکەوتەکانی ژیاندا.
سۆفیەکان زۆربەی کاتەکانی
ژیانیان بێدەنگن و سەرقاڵن
بە دوی گەڕان بەشوێن نهێنیە
قووڵەکانی نێو رۆحدا. خۆ ئەوان
ئەگەر بێدەنگ نەبن ئیتر دەبن بە
بەشێك لەوانی دی! ئەی ئەوەنیە
با پیرم کە من نەم بینیوە لێی
دەگێرنەوە کەهەموو ساڵێك چل
رۆژ گوندی بە جێ هێشتووە و
کەس نەیزانیوە لەکوێ خۆی
حەشاردەدات. ئەو تەنها چل دەنك
خورمای لەگەڵ خۆی دەبرد و کەس
نەیدەبینی و کە سیشی نەدەبینی
بە درێژایی چل رۆژ ! بە درێژایی
ئەو ماوەیە ئەو بێدەنگ دەبوو، لە
خەڵوەتدا دەبوو و گوێی لەروحی
خۆی دەگرت، کە دەشگەڕایەوە
زۆر بەهێمنی قسەی دەکرد وەك
ئەوەی نەیەوێت لە و خەوە قووڵە
بێداربێتەوە. ئەو کاری تەنها ئەوەبوو
بەوانی تری دەگووت دەکرێت
شەڕنەکەن، وشەی ناجۆر بەیەکدی
نەڵێن، ئازاری گیانەوەرەکان
نەدەن و درەختەکانیش نەبڕنەوە؟
پێی دەووتن خۆ ئەگەر تاوێك
بێدەنگ بین دونیا ژێرەوژوور نابێت! ئەو زۆر کەمدووبوو
بەلام دەیزانی کەی دەبێت چی بڵێت. تەماشاکەن چ
ژاوەژاو و فەرتەنەیەکە لە شارەکاندا و پێ دەچێت
بێدەنگی قاتی بووبێت! بێدەنگی خوشەویستیە
و خۆشەویستیش بێدەنگیە. ئەی خۆ جوانترین
ساتەکانی عاشقەکان بێدەنگیانە، ناکرێت تۆ ماچی
لێوی یارەکەت بکەیت و بێدەنگ نەبیت، ئەی خۆ
تێرامان و وردبوونەوەی دوو عاشق لە یەکتری
هەر بێدەنگی دەخوازێ. بێدەنگی موزیکە،
ئاوازێکی پەنهانی دڵە کە ئێمە بەدەگمەن
پەی بەو ئاوازە ناوازەیە دەبەین و تەنها
ئەو کات گوێمان لەو ئاوازە
دەبێت کە بە قووڵی گوێ لە
ترپەی دڵمان بگرین. بەڵام
ئایا ئێمە چ کاتێك گوێمان
لە ترپەی دڵمان دەبێت؟
تەنها ئەو کاتانەی کە
بێدەنگ دەبین ، بێدەنگیەك
کە هەموو دەرگاکانی دەنگ
لە خۆمان دابخەین. ئەزانن
ژیان و مەرگ بە شێوەیەك
لە شێوەکان لە سەر لێدان و
لێنەدانی دڵ وەستاوە؟ ئێ خۆ
هیچیش ڕونادات کەمێك گوێ
لە چارەنووسی ژیانمان بگرین!
یە کێك لە کایە گرنگە کانی
موزیك کاتە، کاتیش لە دونیای



موزیکدا لە ترپەکان و پشوەکان پێکدێت، بۆئەوەی ترپەکانمان گوێ لێبێت دەبێت نرخ بۆ پشوەکان دابنێین. ترپەکان لە موزیکدا بەهێزن یان لا واز، بێ هێزن یان خێران، دیاری کردنی ئەم ترپە جیاوازە ڕەنگاو ڕەنگانەش پابەندە بەوەی کە پارچە موزیکێك گوزارشت لە چی دەکات یان وێنای چ جۆرێك لە باری دەروونی مرۆڤ دەکات. زۆرێك لە پسپۆرانی بواری ریتم پێیانوایە کە «کات»ی ناو دونیای موزیك لە ترپەی دڵەوە وەرگیراوە.

ئەو کاتانەی کەدڵخۆشین و پێدەکەنین ترپەی دڵمان بەهێز و خێرایە، ئە کاتانەش کە خەمبارین، دڵمان سست دەبێت هە روەك چۆن هەندێك دەڵێن دڵم خەریکە دەوەستێت. کەس هەیە لە ئێوە نەی گوتبێت ئاوازێکی هێندە خۆشە دڵ دێنێتە جۆش و خرۆش؟ یان زۆر جار کە بە هەوراز و نشێوەکانی نێو سرووشتدا گوزەر دەکەین ترپەکانی دڵمان هێندە خێرا لێ دەدەن کە هە ندێك جار وا هەست دەکەین خەریکە دڵمان سنگمان شەق دەکات و دەیەوێت بێتەدەرێ. موزیك بێ ریتم مەحاڵە هەروەك چۆن ژیان بێ ریتم مانایەکی نییە. بێدەنگی لە موزیکدا پانتاییەکی گرنگ داگیردەکات و بێدەنگی ئەو ساتانەیە کە نازانین دوای ئەو چی ڕوودەدات! بەرەو کوێ دەچین! زۆر جار سەرسام دەبین و هەندێك جاریش چاوەڕوان دەبین... هتد. کاتێك کە تەماشای چیایەکی زەبەلاح دەکەین، یان لەشەپۆلە تۆ قێنەرەکانی دەریا ورد دەبینەوە ، کە لەسە ر ترۆپکی چیای هەڵگوورد، گمۆ، پیرەمەگروەنەوە چاو لە شیو و دۆڵەکان دەکەین سەرسام دەبین، دەترسین، دەشڵەژێین و لە هەمان کاتیشدا هەست بە شکۆمەنەی دەکەین، هە ست دەکەین کە لە خودا نزیك بوینەتەوە



هەر وەك چۆن شۆپنهاوەر دەڵێت: روحە بەرزەکان لە شوێنە بەرزەکاندان. ئەی ئەوەنیە مرۆڤەکان کە سوجدە بۆ خودا دەبەن روو لە ئاسمان دەکەن و پێیان وایە کە خودا لە بەرزترین شوێنەکانی ئاسمانە! ئەو شوێنەی کە ئێمە هەرگیز پێی ناگەین !! هەموو ئەم شتانە بێدەنگمان دەکەن یان وا دە خوازێ کە بێدەنگ بین لە بەرانبەریاندا، کە بێدەنگیش بووین ئەو کات تێدەگەین کە بێدەنگی چ مانایەکی ئەفسوناوی هەیە. لە هەر چرکەسەتێکی فیلمێکدا کە موزیك دەوەستێت یان هیچ دەنگێك نەمێنێ شتێك ڕوودەدات، شتێکی چاوەروان نەکراو، زۆربەی جارەکان کارەساتی ناخۆش ڕوودەدات ، ئایا دیقەتی ئەوەتان داوە کاتێك کە شێرێك دەیەوێت هەڵمەت بەرێ بۆ نێچیرەکەی تەنانەت چۆن بە ئاستەمیش هەناسە دەدات؟ ئەم جارە کە سەیری فیلمێکت کرد ئا گاداری ئەو ساتەوەختەبە! بێدەنگی ئازایەتیە، ئەوانەی کە لە شەڕدا زۆر جنێودەدەن هەمیشە بەزیوون! کابرایەك لە گوندی ئێمە هەیە

**تراژیدیای گەورە کارە**
**نابەجێکانی خەڵکە**
**خراپەکان نییە، بەڵکە**
**تراژیدیای گەورە**
**بێدەنگی کەسە باشەکانە.**

**مارتین لۆسەر کینگ**



ناوی عەبدوڵای ناسکە حمەدە کە باوکی ناوی ئە حمەدە بەڵام لە بەر کەم دوویی پێیان دەگووت ناسکە حمەد، عەبدوڵای کوری کە یە کێکە لە پیاوە جەبەزەکان، پێم وانیە کەس دەرەقەتی هاتبێ لە گوند، ئەو هەرگیز شەڕی نەدەکرد بەڵام کە شەڕیان پێ دەفرۆشت تاکە براوە هەر خۆی بوو بێ ئەوەی نەك جنێو بەڵكوو تاقە وشەیەکیش بڵێ! بێدەنگی خۆی دەنگێکی گەورەیە، ئەو دەنگەی کە بەبێ ئەو هیچ مانایەك بۆ خودی دەنگ خۆی نییە، هەروەك چۆن ژیان و مەرگ، خۆشەویستی و رق، چاکە و خراپە..هتد بێ یەکدی مانایان نییە. ئێمە لەساتەوەختە سەختەکانی لە دەستدانی ئازیزانماندا بێدەنگ دەبین، ئەو ساتانەی کە خۆی هاوارێکی زۆر گەورە دەخوازێ! ئێ خۆ لە پرسە کانیشدا ئێمە هەمیشە بێدەنگین. هەروەك باپیرم دەیگوت ئەگەر تاوێك بێدەنگ بین دونیا ژێرەوژور دەبێت؟ باوابکەین بزانین چی روو دە دات!

## من گڵۆپەکان دەکوژێنمەوە

«من گڵۆپەکان دەکوژێنمەوە« ناونیشانی ڕۆمانێکی (زۆیا پیرزاد)ە (شادی نیکخا) کردووەیەتی بە کوردی و لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە چاپ کراوە... زۆیا پیرزاد یەکێکە لە نووسەرە هاوچەرخەکانی ئێران و ساڵی ١٩٥٢ لە دایکێکی ئەرمەنی و باوکێکی ڕووس لە ئابادان لەدایک بووە. خاوەنی سێ کومەڵە چیرۆک و دوو ڕۆمانە و تەواوی کارەکانی وەرگێردراونەوەتە سەر زمانی فەرەنسی...

«من گڵۆپەکان دەکوژێنمەوە» لە بەناوبانگترین کارەکانی ئەم خانمە نووسەرەیە و تا ئێستا چەندین خەڵاتی گرنگی پێ بەخشراوە، لەوانە (خەڵاتی باشترین ڕۆمانی ساڵی ٢٠٠١ لە فێستیڤاڵی ئەدەبدا، خەڵاتی هوشەنگ گوڵشیری بۆ باشترین ڕۆمانی ساڵی ٢٠٠١، خەڵاتی کتێبی ساڵ لە وەزارەتی ئیرشادی جمهوریی ئیسلامی ساڵی ٢٠٠٢، براوەی سوپاسنامەی یەکەم خەڵاتی ئەدەبیی یەلدا ساڵی ٢٠٠١). پیرزاد ئێستا لە ئەڵمانیا نیشتەجێیە و هەر بە فارسی دەبنووسێت.





# بۆقی ناو بیره تەنکەکە

**نووسینی: سەردار عەزیز**

سەربوردیەکی چینی

**The Frog in the Shallow Well, a Chinese Fable**

جارێکیان بۆقێك، کە لە بیرێکی تەنکدا دەژیا، کیسەڵێك لە دەریاوە بوو بە میوانی. بۆقەکە زۆر دڵخۆش بوو بە مەنزڵی، هەرکە کیسەڵەکە گەیشت دەسیکرد بە پۆز لێدان بەسەر کیسەڵەکەدا. ‹من هێندە دڵخۆشم›، بۆقەکە وتی، ‹کە ئەچمە دەرەوە ، بە قەراخ ئەم بیرەدا بازبازێنمە، کە دێمەوە بۆ ماڵەوە، لە کونی دیواری بیرەکەدا ئەحەسێمەوە›.

کە خۆم هەڵ ئەدەمە ناو ئاوەکەوە، ئاو هەتا بن باڵم دێت، لەسەر سك بەسەر ئاوەکەوە خۆم رائەگرم. کە ئەرۆم بۆ ناو لیتەکە، قاچە پانەکانم لە قوڕدا دائەپۆشێرێن.

لە دەوری خۆم: لە کرمی پێچاوپێچ، لە قرژانگ، هەروەها لە سەرەمێکوتە دەنوارم، هیچ کامیان بە من بەراورد



ناکرێن. من یەزدانی ئەم
بیرە شکۆمەندم. زۆر
دڵخۆشم. ئەی ئازیزم بۆ
زوو زوو نایەی لە جێگای من
بنواڕی؟
پێش ئەوەی کیسەڵی دەریا
قاچی چەپی بگاتە بیرەکە،
ئەژنۆی ڕاستی گیربوو. ترسا
و پاشەکشەی کرد. کیسەڵ
دەستی کرد بە باسی دەریا.
تەنانەت دووری هەزار
میلیش ناتوانێ بیرۆکەی
ئەوەت بداتێ کە دەریا چەند
بەرینە. تەنانەت بەرزایی
هەزار مەتر ناتوانێت وێنای
قوڵی دەریات بۆ بکات. لە
ساتی لافاوە مەزنەکاندا،
ئاوی دەریا زیاد نابێت. لە
ساتەوەختی وشکەساڵیدا
ئاوی دەریا کەم ناکات.
ئاستی دەریا لە گەڵ
تێپەرینی کاتدا ناگۆڕێت،
هەروەها بە ڕێژەی باران
بارین نە بەرز ئەبێتەوە
نە نزم. گەورەترین شادی
ئەوەیە لە دەریادا بژیت.
پاش گوێبیستنی ئەم وشانە،
بۆقی بیرە تەنکەکە حەپەسا کە بۆی دەرکەوت دونیای ئەو چەند بچوکە،
هەستی بە بێزاری کرد.

بۆچی ئەم سەربوردەیە دەتوانێت ببێتە دیدگای ئێمە بۆ تێڕامان لە
ئەدەبی سەفەر. چونکە زۆر بە سانایی ئەم سەربوردە کورتە، هەموو
تایبەتمەندیەکانی سەفەر لە خۆی دەگرێت. بۆقێکت هەیە
دڵخۆش، دڵخۆش تا ئاستی لە خۆبایی بوون. ئەم بۆقە لە خۆ
باییە چونکە تەنها بە بیرە تەنکەکەی خۆی ئاشنایە. بۆقی
داماو بۆیە دڵخۆشە چونکە دونیای ئەو دیو دونیاکەی
خۆی نابینێت، بیری لێناکاتەوە، بوونی نییە لەلای.
بۆقی دڵخۆش وەك کەسێك وایە هەرگیز زێدی
خۆی جێ نەهێشتبێت. هەموو سەرچاوەی جوانی
و خۆشیەکان تەنها لە دونیا بچکۆڵەکەی خۆیدا
ببینێت. بەڵام ئەم دونیایە لەرزۆکە، گەر
بێتوو کەسێکی وەك کیسەڵی نەگریس
بێت، باسی جێگایەکی تر بکات ئەوا
هەرزوو، جوانی و خۆشیەکانی دونیای
تەسك، پووچ دەبنەوە.



سەفەر، سەرەتای بچوکبوونەوەی دونیای
خودە. سەرەتای گەورەبوونی ئاگاییە.
ئاگایی و جوگرافیای شادی پێکەوە
ناگونجێن. لە سەفەردا ترازانێك دروست
دەبێت لە نێوان زێدی خود و دونیای
دەرەوەدا. لە ئەنجامدا وەك لە دونیای
بۆقە لە خۆباییەکەدا دەیبینین، دەبێتە هۆی
دارمانی دونیا ئەفسانەییە جوانەکە. ڕەوایە
بپرسین: چ پێویستە بڕۆین بۆ ئەوەی دڵتەنگ بین؟
ئاشنابوون بە دونیایەکی تر و کەوتنە بەراوردکردن

کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی تێکدانی هەردوو
دونیا. سەفەر بڕێکی زۆری دڵتەنگیە، ڕاراییە. مرۆڤ
هەتا زیاتر بڕوات زیاتر تینوودەبێت بە مەعریفە و
دیدی بەرامبەر شوێن دەگۆڕێت. بەڵام ئەوەی لە
سەربوردی بۆقەکەدا دەیبینین بۆقەکە هەرچەندە
هەموو کاتی لە دونیای تەسکی خۆیدا بەسەر دەبرد،
کەچی زانیاریەکانی دەرباری دونیا تەسکەکەی هەموو
هەڵە بوون. گیرسانەوە لە جێگایەکدا گیرسانەوەیە
لە دۆخێکی دۆگمایی عەقڵیدا. بەڵام لە بەرامبەردا
سەفەر ناسەقامگیریە، ڕێژەییە، تێربوونی تیادانیە.
دەبێ بڕۆین بۆئەوەی زێدی خۆمان بناسین. دەبێ
دابڕێین هەتا بزانین لە کوێدا نیشتەجێین. پاش
سەفەر، زۆر بە ئەسپایی عەشقێك سەرلەنوێ بۆ
زێدی خود سەرهەڵدەداتەوە، عەشقێکی سەیرە. زۆرن
ئەوانەی پاش گەڕان بە دونیادا لە جێگایەکی دوورە
دەست، لە گوندێکدا دەگیرسێنەوە. بەڵام ڕەنگە سەفەر
بمانکاتە بوونەوەرێکی تر. بوونەوەرێك بە ئەخلاقێکی
ترەوە، بە هەست و سۆزێکی ترەوە. ناتوانیت
چیدی ساویلکانە نیشتمان پەروەربیت،
وەها بزانیت خاکی تۆ بێوێنەیە یان
گەوهەرە. کاتێك گەوهەربوون تەنها
بریتیە لە دیدی تۆ بۆ خاکی خۆت،
وە هەموو کەسێکی تر وەك تۆ هەمان
دیدی هەیە بۆ خاکی خۆی. کە خاکی
هەموان گەوهەر بوو ئیتر
چ پێویست

بە ئاماژە پێکردن دەکات. نیشتمان پەروەری
تێکەڵکردنی خاك و خوێنە. ئەم تێکەڵەیە ڕەگی
هێندە قووڵە لە ئەدەبی ئەڵمانی و نەمساویدا
کە دەتوانین بڵێین باڵاترین دیدە. ئێمە کە
سەفەردەکەین وەك کێ سەفەردەکەین. مرۆڤی
کورد وەك کوردێك سەفەرناکات. کوردبوون
شوناسێکی بریندارە. هێشتا شێوازێك نییە لە
دونیابینی. کورد کە پەیوەندییەکی سیاسی و
ڕۆمانسی هەیە لە گەڵ ماڵدا، کە لە ماڵدایە لە
ماڵ نیە وە لە ماڵ دەبرێت وەك منداڵ بیری
دایکی بکات، بەهەمان شێوە بیری ماڵ دەکات.
بەڵام بەجێهێشتنی ماڵ، بۆ هەمیشە گەڕانەوە
ئەکاتە خەونێکی مەحاڵ. سەفەری کورد، سەفەری
بوونەوەرێکە بە دوای خۆیدا، کە لە ساتی
یەکەمەوە لە خۆی هەڵدێت. ئەم جۆلانێیە نێوان
هەڵاتن و گەڕانەوە تەنها لە مەعریفەدا ڕووئەدات.
مەعریفەیەکی فرە ئاستی قووڵ. مەعریفەش
بەم ئاستە دیسانەوە مەحاڵە. بیری مرۆڤ بە
زۆری لە دەوری هەڵاتن و گەرانەوە دەخولێتەوە
وەك چۆن سۆفیەك لە دەوری مەزاری شێخەکەی
دەخولیتەوە. هەمیشە سەفەر دوو جۆرە: جۆرێکیان
برایمی وە جۆرەکەی تری یولیوسێس. برایم
دەروات و ناگەڕێتەوە. ماڵ لە گەڵ خۆیدا دەبات.
یولیوسێس بۆئەوە دەروات بگەڕێتەوە. هەندێك
ماڵ لە ناخیاندایە و هەندێکی تر لە سەر پارچە
خاکێك لە سەر ئەم گۆی زەویە. ماڵی پەیوەست
بە خاکەوە لە دونیای نوێدا ماڵێکی هایدگەرییە.






ماڵی پەیوەست بە ئەخلاقەوە ماڵێکی لیڤیناسییە. خاك ئەو پانتاییەیە کە هەمیشە زوحاکانە تینوە بە خوێن. بۆیە مرۆڤ هەتا ڕەگی کەمتربێت مرۆڤترە. بێرەگی یان ئەوەی دۆلۆز و گیتاری ناوی دەنێن رایزۆم، بوونەوەرێکە وەك هەرێز دەڕوات و ڕەگێ کەم دادەکوتێت و بەردەوام دەبێت لە سەر ڕۆیشتن. لەم نوسینانەی کە لەم گۆڤارەدا دەینوسم، تێرامانی منە وەك گەریدەیەك لە کیشوەرێکی ساردی وەك ئەوروپا. سەفەری من تەنها بۆ وڵاتان و شاران نییە، هەروەها بۆ گەڕان نییە بە دواى ماڵێکی تردا. سەفەری من ڕۆحێکی لماویە، هەمیشە وشك هەڵاتوە بۆ ئاوی نوێ. من لە دونیایەکی وەك دونیای بۆقی سەربوردە چینیەکە هاتمە دونیاوە. شەڕەکان ناچاریانکردم بە هەڵاتن. کە هەڵاتم عەشق لێیدام، عەشقی گەیشتن، عەشقی بینین، عەشقی گەڕانەوە. ئەمانە هەموو عەشقی نەگریسن، هەرچی بکەی فەراهەم نابێت. بۆیە کە عاشق دەبم ڕەنگێکی ئەنارکیستانە ئەمپۆشێ. جوگرافیایەکی تایبەت لە خۆیم ناگرێت حەزئەکەم شوبکەم بە با. بۆ هەمیشە لەگەڵ خۆیدا بمبا. من نە بۆقەکەم نە کیسەڵەکە، بۆقەکەشم و کیسەڵەکەش. چونکە لە نێوان بۆقەکە و کیسەڵەکەدا هاوبەشییەکی زۆر هەیە. گەر بۆقەکە دونیای خۆی پێخۆشە پێش ئاشنابوونی بە دەریا، ئەوا کیسەڵەکەش عەشقی دونیای خۆیەتی، بگرە زیاتر پاش بینینی بیرەکە. ئەگەر بێتوو کیسەڵەکە گوێ لە رازی باڵندەیەك بگرێت کە باسی فرین دەکات دەبێ چ هەستێکی هەبێت بەرامبەر دەریا، بۆیە خۆشی هەمیشە جۆرێکە لە خەفڵەت، لە باوەرهێنان. بە هەمانشێوە لە ماڵ بوون بڕوابوونە بە دابڕان لە دونیا بۆ ساتێك، بە کردەیەکی مەحاڵ. بەڵام بەبێ ئەم دابڕانە ئامادەبوون لە دونیادا مەحاڵە. مەعریفە هات و خۆشیەکانی ژیانی کوشت، تازە درەنگە بۆ گەڕانەوە.



# شارێک کە دەمناسێت

ئەم شارەی کە دەمناسێت کۆرکە. کۆرك یانی ئە وپارچە دارەی بە سەر بوتڵی شەرابەوەیە، بەڵام
ناوی ئەم شارە ئەو مانا ناگەیەنێت. لە یەکێك لە مانا کۆنەکانیدا وشەی کۆرك یانی زۆنگاو.
ساڵانێکی زۆر لەمەوپێش سەرەتا وەك کرێکاری مەزرایەك لە پشت ڤانێکی رەنگ سوری
تەسکەوە سەردانیم کرد. ڤانەکە لەلایەن پیاوێکی رەبەنی بە تەمەنەوە لێدەخوڕا کە ناوی
مایك بوو. ئایرلەندا وڵاتی پیاوە بە تەمەنە رەبەنەکانە. ئێستا کە بۆی دەگەرێمەوە مامۆستای
زانکۆم. لە نێوان ئەم دوو خاڵەدا دونیایەك هەیە کە تەنها هێمن موکریانی واتەنی دەتوانم بڵێم
‹لە کوێوە بۆ کوێ›. کە دەگەم، درەنگی ئێوارێیە. فرۆکەخانە میانەبەنەکە بۆنی بێدەنگی
لێدێت. پۆلیسە ئافرتەکە لێم دەپرسێت لە کوێوە دێیت، لە وەڵامدا دەڵێم
ئەمستردام. تاکسیەك دەمباتە میوانخانەکەی پار. ئەمساڵ
ژمارەی ژورەکەم بیستە. بۆنی لیلیاکە سپیەکەی



بەر پەنجەرەکە هەست دەکەی پانتایی میوانخانەکەی فراوانکردوە. سەرەتا دەبێت بنوم، بەڵام ناتوانم بیر لە رێگاکەم نەکەمەوە، لە ناوەندی ئەوروپاوە فریم، بە سەر چیاکانی ئەلپدا بۆ قەراخەکانی دەریای باکور لە ئەمستەردام. شارێ پڕ لە سۆزانی، هەر هێندەی ماچێك دوورە لە دەریاوە. لە نێوان نەمسا و هۆڵەندا جیاوازی زۆر هەیە بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە کاریگەری ئیمپراتۆریەتی فەرەنسییە. ناپلیونیەکان لە ئەلپ شکان بەڵام فەرەنسا داگیرکەری هۆڵەندا بوو. ئەمرۆ کە هۆڵەندیەکان پەردەی پەنجەرەکانیان داناخەن تەنانەت لە کاتی سێکسکردنیشا بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ رۆژانی ژێر دەستی کە دەبوو حەسحەسە فەرەنسیەکان لە پەنجەرەکانەوە ماڵەکان ببینن. بەڵام لە نەمسا کۆنگرەی ڤییەنا هاتە ئارا کە هێزی دژە شۆرشی ئەوروپا بوو. پاشان جارێکی تر فریم، لە دڵی تاریکی دەریادا، وەك ناوی رۆمانەکەی کۆنراد، لە قەراخەکانی ئەتڵەسی نیشتمەوە. هاتم بۆ شارێك ئەمناسێت. چ چێژێکە برۆیت بۆ شارێك بتناسێت. روانین بۆ گۆرانکاریە، بۆ ناسینەوەیە، بۆ یادەوەریە، بۆ سەرلەنوێ ژیانەوەیە. شوێن و کات بە ئاستێك تێکەڵ دەبن نازانیت لە کاتدا دەژیت یان لە شوێن. نامەوێ ئەو جەدەلە دەست پێبکەم.

کوچە و کۆڵانەکانی ئەم شارە دەمناسێت، کافێ و کتێبخانەکانی، گەرەك و ماڵەکانی. هەمیشە چەند رۆژێك پێش سەفەر شەوقی ئەوە دام ئەگرێت، کە دەگەرێمەوە بۆ جێگاکانی یادەوەری. خەیاڵ دەمباتەوە کافێکەی سەرەتای واشنتون ستریت، رۆژنامەی گاردیان دەخوێنمەوە، جارێکی تر گوێ لە گۆرانی ئینگلیزی دەگرم. ئێمە چەند گیرۆدەین بە وێناکانی خەیاڵ، چەند حەزدەکەین سەردانی رۆژانی لە دەستچوو بکەین. کێ هەیە مارسێل پرۆستی نەیەتەوە یاد. شارێك کە لە یادەوەریدا نیشتەجێیە، جودا لە شارێك کە لە چاوەروانیدا خۆی مەڵاسداوە. یەکێك لە ئاڵۆزییەکانی سەفەری ئەمرۆ ئەوەیە کە مرۆ پێش ئەوەی بگاتە شوێنێك خەیاڵێکی هەیە دەرباری شوێنەکە، ئەم خەیاڵە سەفەرەکەی وەها لێدەکات کە ببێتە گەران بەدوای تێرکردنی خەیاڵەکانیدا. گەربێتوو خەیاڵەکان و وێنە پێشینەکانی یەکتری مارەنەکەن ئەوا توشی جۆرێك لە نائومێدی دەبێت.

کە دەگەمە ئوتێلەکە پێش ئەوەی بنوم



جارێکی تر بیر لە ئەمستەردام ئەکەمەوە. شارێك سەرتاپای دەستکرد، بیر لە چرپەی کەناڵەکان ئەکەمەوە، ڕۆیشتنی پاپۆری شین. هێندە ڕۆژگارێ زوو لە ئەمستەردام بووم ئێستا وەك شارەکانی قوبلای خان لە ڕۆمانی شارە نەبینراوەکانی کالڤینۆدا دێتەوە یادم. بەڵام ئێستا دەبێت بنوم. نوێنەکەم نەرم و شاهانەیە، بۆ چەندین شەوی تر لێرەم. کە بە ئاگادەبمەوە دەچم بۆ بەرچایی، وەك پار ئۆملێتی ئیسپانی دەخۆم و بەبێ دەنگی لە شاری ژێر هەوری خەماوی دەنوارم.

بۆ ئەوەی خەو بمباتەوە هەندێکی تر لە کتێبەکەم دەخوێنمەوە. بۆچی مارکس ڕاست بوو، لێکۆڵەرەوەی ئەدەبی بە ڕەچەڵەك ئایرلەندی تێری ئیگلتن نووسیویەتی. ئیگلتن بە زمانێکی تێکەڵ لە سانایی و ئاڵۆزی دەیەوێت وەڵامی هەموو ئەو خراپ تێگەیشتنانە بداتەوە کە بە ناوی ڕەخنەوە لە مارکس دەگیرێت. کتیبەکەم لە ئەمستردام کڕی. مارکس ئەو پیاوەی کە لە هەموو بیریارێکی تری ڕۆژئاوایی لە کوردستان ناوی هێنراوە و دەهێنرێت، لە هەموو فەیلەسوفێکی تر زیاتر وێنەی هەڵواسراوە، خەڵك لە پێناویدا یان لە پێناو ڕێبازەکەیدا کوژراون. بەڵام مارکسی کوردی، لە بری ئەوەی کارل مارکس بێت کاك مارکسە. مارکس چونکە هێندە ناسراوە نەناسراوە. چونکە کاتێك کەسێك لە کایەی تەسکی بیرکردنەوە دێتە نێو کایەی فراوانی سیاسەت ئەوا هێندە ڕواڵەتی نوێ وەردەگرێت کە نازانرێت لە کرۆکدا چی دەڵێت.

کە سبەینێ دێت سەرەتا دەرۆم بۆ زانکۆ. بست بە بستی سیخناخە بە یادەوەری. لە کافێ میان بەنەکەدا لەگەڵ قاوەدا ڕۆژنامە دەخوێنمەوە، لە ئافرەتە ئایرلەندیەکان دەنوارم. تێپەری و ڕۆی ڕۆژانی عەشق. پاش سەرادنی کۆلێژەکەم دیداری خوێنکاران، بە کاوەخۆیی دەرۆم بۆ ناوەندی شار. کۆرك شارێکی کۆنە بەڵام بچوك. ناوەندەکەی لە شێوەی دورگەیەکدایە، کە ڕۆژانێك بەلەم بە زۆر جادەکانیدا ڕۆشتوە، ئەو سەردەمە پێیان وتوە ڤینیسیای ئایرلەندا. لە وڵاتی ئایرلەندا شاری ژمارە دووە، کە بە شاری یاخیبوان ناسراوە. کە سەرتا لێرە جێگربووم هەستم دەکرد سەر بە سەردەمێکی ترە. ئایرلەندا وڵاتێکی جودایە لە بەشەکانی تری ئەوروپا. لێرە پانتایی گشتی بارە. بار جێگایەکی تەڕ و شێدار و نیمچە تاریکە کە مۆسیقا و کحول لە دونیای دەرەوەت دادەبڕن. ئەوروپا پانتایی کافێیە. کافێ پانتاییەکی جودایە، لە کافێدا مرۆڤەکان لە نێو ڕوناکیدا بە ئاگاییەوە وە بۆ زۆر دڵنیابوونیان لە بەئاگاییان بەردەوام قاوە دەخۆنەوە. کافێ جیگای قسەکردنە، قسەکردن دەربارەی دونیا. بۆیە کافێ پانتاییەکی دابڕاو نییە لە دەرەوە، بە پێچەوانەی بارەوە جێگایەکە کە دەرەوە تیایدا دەکرێتە بابەتی باس. ژیان هەمیشە سەخت بووە لە ئایرلەندا. بە جۆرێك ژیان





دەبێت لێی هەڵبێیت. ئایرلەندیەکان ژێردستەی ئینگلیزبوون کە برسێتی بەسەردا هێنان تا بە سەدان هەزاری لێ کوشتن و بە ملیۆنی لێ پەرتەوازەی دونیا کرد. کە ئایرلەندیەکان سەرخۆش دەبن و دەست دەکەن بە گۆڕانی وتن هەمیشە دەربارەی: دووری، غەریبی، گەڕانەوە و سەختی ئەمانە ئەدوێن. من لە سەرەتای ئەم هەزارەیە هاتم بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەمانەدا بژیم. چێشتەنگایەك کەشتیەکی تەمەڵ لە نۆرماندیەوە گەیاندمیە بەندەرە خەواڵووەکە. پاش ئەوە ژیانێکی تر دەستی پێکرد. ژیانێك کە هەتا ئێستا بەردەوامە. ئایرلەندیەکان لە رەگەزێکی تایبەتن، مرۆڤێکن تێکەڵ لە ئەفسانە و خەبات، لە خۆشەیستی وڵات و هەڵاتن لێی، لە گۆرانی و کهول و کڵێسا. ئایرلەندا پانتاییەکە ناگێردرێتەوە. زمانێکە کە ئینگلیزیە بەڵام بۆیاخکراوە بە زمانی ڕەسەنی ئایرلەندی. زمانێك کە قسەکردن پێی جۆرێکە لە بەرگری. کە ئایرلەندیەکان بە ئینگلیزی دەدوێن هەمیشە بە جۆرێك ئەدوێن کە گاڵتەکردنە بە شێوازی ستاندارد. بە ئەنقەست زمان دەشێوێنن. بەڵام ئینگلیزیزانە مەزنەکان ئایرلەندین، تەنها ناوی جۆیس بەسە.

کە من دێم بۆ ئێرە جۆرێکە لە گەڕانەوە بۆ ماڵ، بۆ ناو کەس و کار و هاورێ و جێگا ئاشناکان. ماڵ تەنها بریتییە لەمانە. لەم شارەدا من گۆڕام، لە گەرمیانیەکەوە بۆ ئینگلیزی زانێك، بۆ خوێنەرێك. لێرەدا دڵخۆش، دڵ شکا و رۆژگارێکی زۆرم بە بیرکردنەوەوە خەرجکرد. رۆژگارێکی زۆرتر لە ژێرزەمین کتێبخانەکاندا، لە هۆڵی سینەماکاندا، لە ماڵی ناسراواندا، لە چەقەچەقی سیاسەتدا.

# له ڕێگادا بۆ پراگ

له بەرەبەیانی زوودا من و نامۆ و دایکی له شاری ئینسبروکەوە، له چیاکانی ئەلپی نەمسا، به شەمەندەفەر بەرێکەوتین بەرەو پراگ. دەمێك بوو خواستی ئەوەمان هەبوو سەفەرێکی وەها بکەین. پراگ پاریسی رۆژهەلات، سەدایەکی رۆمانسیانەی هەبوو. بۆ ئێمە که ئەدەب به گشتی و ئەدەبی ئەڵمانی بەتایبەت وەهایکردبوو که سەردانێك له زێدی کافکا برێك تامی زیاتربێت. ئەم نووسینه تەنها باس له رێگای سەفەر دەکات، نەك پراگ خۆی. شەمەندەفەرەکه له ناو نەمسادا هەتا شاری لینزی بردین. لەوێ له ماوەی کەمتر له نیو کاتژمێردا دەبوو شەمەندەفەرەکەمان بگۆرین و سواری شەمەندەفەری پراگ بین. شەمەندەفەرەکەی پراگ هی وڵاتی چیك بوو. کورت و کۆن و ناقۆڵابوو. که گەیشتین من هەر له خۆمەوە دام له قاقای پێکەنین. کۆمەڵێك وێنا و بیر و نوکتەی ستالینی هێنابومیانه سەر جۆش خرۆش. هەستم دەکرد شەمەندەفەرەکه ستالینیه. هیشتا هیچ کەسێکی تر لەوێ نەبوو. که چوومه ناوەوە له جۆری



فارگۆن دارەکان بوو. لە سەرەتای فارگۆنەکەوە ئاودەستێکی هەبوو نە ئاوی تیادابوو نە هیچ شتێکی پاککردنەوە. گەر مرۆڤ لە ژێر سایەی ستالیندا بژی چ پێویستی بەوە هەیە کە خۆی پاککاتەوە لە پیسی. خێزانیی چوینە فارگۆنێکەوە، نامۆ و دایکی حەزیان لەوەبوو کە نانی نیوەڕۆ لە قەتاردا بخۆن، بەڵام شەمەندەفەرەکە چێشتخانەی تیادا نەبوو. دیسانەوە جارێکی تر ستایلینیەتە. وەك ستالین مرۆڤ دەبێت پۆڵابێت، نان خواردنی چی. هەر زوو ئەو خەیاڵەم رەوییەوە کە من گەشتیارم، هەستم دەکرد دەڕۆم بۆ دونیایەکی سەیر، ئەمە سەفەرێکی پڕ لە رووداوی چاوەڕواننەکراوە. کورسی دانیشتنەکە ئەستور و نەرم بوو. بەحەسرەتەوە دەمراونی بکەوینە رێ. دانە دانە خەڵك هەتا دەهات دەهاتنە ناو شەمەندەفەرەکەوە. رێگاکە دوورە و نزیکەی شەش کاتژمێر دەخایەنێت. بۆیە بۆ رزگاربوون لە خەوەنوتکەی پاش نیوەڕۆ ژنەکەم خێرا قاوەیەکی خەستی تاڵی بۆ هێنام. خۆر کز و بەهاری بوو.

کە پیرە شەمەندەفەر کەوتە رێ لەرزانە و دەنگە دەنگ و جیر جیریش دەستی پێکرد. هەر زوو لە ڕووباری دانوب پەرینەوە. من هێشتا لە زەوقی ستالینیدابووم. دیکتاتۆرەکان پاش مەرگیان مایەی کۆمیدین، لە ژیانیاندا مایەی تراژیدیان. شەمەندەفەرەکە خاوبوو لە هەموو گوندێکیش دەوەستا، هەندێك جاریش لە پڕ لە جێگایەکی چۆڵدا. پاش دوو کاتژمێر گەشتینە سنور. من پڕ لە شەوق بووم بۆ بینینی گوندی خەواڵوی ژێر بەفر. لە ویستگەکە بە شەمەندەفەری تری ژەنگاوی بار هەڵگر تەنرابووین. بەفر پەپولەییانە دەباری. دیمەنێکی دڵگیری سەیر بوو. ساتێك هەستم دەکرد دیمەنێکە لە دیمەنەکانی فلیمی دوکتۆر ژیڤاگۆ، ساتێکی تر بەفری پاموکم دەهاتەوە یاد. بەفر کە دەباری جوان بوو، لە سەرەتای بینینەوە هێشتا جوان بوو بەڵام کاتێك کاتژمێر لە دوای کاتژمێر سەرتاپا پانتاییەکان لە یەك رەنگی کفن ئاسادا نوقمبووبوون حەزت دەکرد رەنگێکی تر ببینی. کە لە سنور پەرینەوە کەس هیچی لێنەپرسین، بە هیچ شێوەیەك هەستت نەدەکرد کە دەپەریتەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر. پێش روخانی دیواری بەرلین ئەم پانتاییانە وەك جیهانێکی تر وەهابوون. جوگرافیا و سیاسەت چۆن پەیوەندیەکانی مرۆڤ دەگۆڕێت. دیمەنی تاك



ڕەنگی بەفر، زۆر مۆنۆتۆن بوو. کە لە ویستگەکان دەوەستا روانین لە دیمەنەکان سەرنج ڕاکێش بوون. هەمیشە سەرزەویە نوێکان بڕێکی زۆر شاعیریەتیان تیادایە. هەموو شتەکانی شایستەی بینینن. کە بە گوند و شارۆچکەکاندا تێدەپەرین ژەنگ و خاوی و لاوازی و بێ هیوایی هەموو شتێکی ڕەنگرێژ کردبوو. کۆمۆنیزم هیوا کوژە. هیچ بەهانەیەك نییە بۆئەوەی خۆت بڕەتێنی، هەوڵ بدەی هەمیشە هەموو شتێك وەك خۆیەتی. چونکە کۆمۆنیزیم دوا قۆناخی گەشەیە ئیتر کاتی پشودانە لە گەشە و بەرەو پێشەوە چوون.
لە ناوەندی ڕێگا لە یەکێك لە ویستگەکان پیاوێکی ڕەنگ چینی سەرکەوت، داوای کرد کە ئایا دەتوانێت بێتە فارگۆنەکەی ئێمە. منیش بە سەر لە قاندێکەوە ووتم بەڵی. پێش ئەوەی چاکەتە ڕەنگ ڕەشەکەی هەڵواسێت لێم پرسی چینیت، وتی نەخێر، تایوانیم. ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟ کوردستان. لە کوێیە؟ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست. لە کوێ، لە عێراق، ئێران، سوریا، تورکیا. تۆ عێراقیت؟ تۆ چینیت؟ نەخێر. منیش نەخێر.
ئیتر گفتوگۆمان هەتا شاری پراگ درێژەی کێشا. پیاوەکە تەمەنی لە ناوەندی چلەکاندا بوو خەڵکی تایپێ پایتەختی تایوان بوو. کاری بەڕێوەبەری بازرگانی دەکرد لە یەکێك لە کۆمپانیاکان. لە ناخەوە کەسێکی دڵتەنگ بوو. دوو کچی جوانکیلەی مناڵی هەبوو کە هەفتەی تەنها یەك ڕۆژ دەیتوانی بیانبینێت. خۆی و ژنەکەی لەیەك جیابوبوونەوە. گەرچی موچەی دوو قاتی زۆرێك لە خەڵکانی تر بوو بەڵام باسی هەرچیەکی بکرادیە لە روانگەی پارەوە هەڵیدەسەنگاند. بەلامەو سەیر بوو ژیان هێندە پڕ لە ژمارەبێت.
پیاوە تایوانیەکە ناوی جۆ بوو. لە زانکۆ ئەدەبی ئینگلیزی خوێندبوو، بەڵام تۆزقاڵێك چێژی ئەدەبی تیا نەبوو. کاتێك لێم پرسی چی خۆشە لە پراگ بیکەین، بۆئەوەی بزانم زەوقی چۆنە، لە وەڵامدا ووتی برۆن بۆ سینەما، یان یاری تێنس. خەرێك بوو بە سەریدا هاواربکەم، هەی مرۆڤ، من ئەم هەموو ڕێگایە دەبڕم بۆئەوەی برۆم بۆ سینەما، لە هەر جێگایەکی تر دەتوانم فلیم ببینم، یان یاری تێنس بکەم. لەو هەموو سەروەتە و زەخیرە مەزنەی پراگ هیچی بەلاوە جێگای بایەخ نەبوو. تایوان ئەو بەشەی چینە کە پاش شۆرشی کۆمۆنیستی چین زۆرێك لە چینی نەیاری کۆمۆنیزم لە خاکی سەرەکی چین هەڵاتن بۆ نێو ئەو دورگەیە. ئەمرۆ تایوان یەکێکە لە هەرە قەرەباڵغترین جێگاکانی دونیا. ژیان ڕاکە ڕاکە و پووچە. پیاوە تایوانیەکە پێی خۆش نەبوو وەها دەژی. دڵتەنگ بوو بەرامبەر جۆری ژیانی بەڵام نە دەیتوانی جۆرێکی تر بژی وە نە دەیخواست بیری لێبکاتەوە. هەر جۆرە گۆڕانێکی بە سەخت و پروکێنەر لە قەڵەم ئەدا. بیرم لە کوردستان دەکردەوە چۆن بە هەمان شێوە پارە خەریکە هەموو جوانی و بەها و ڕێز و پەیوەندی و جوانیەکانی لوش ئەدات. لە تایپێ ژیان



هێندە گرانە زۆرێك لە خەڵك دەخوازن بە تەنها بژین. جۆن پێی دەوتم. ژیان گران نییە، ژیان بە ئەنقەست گران دەکرێت. مرۆڤ هێندە زوو فریو دەخوات کاتێك درۆکان لە لایەن ناوەندە گەورەکانەوە دێنە دەرێ. ژیان لە دەست چووە. مرۆڤ هەر ئەوەندەی بۆ ماوەتەوە بە دوایدا رابکات.

قسەکردن لە گەڵ جۆندا لە دیمەنەکانی پشت پەنجەرەکەی دابریم. زیاتر چێژم لەوە وەردەگرت کە بزانم ژیان لە جێگایەکی تر، لە دونیایەکی تر، لە کۆمەڵگایەکی تر چۆنە. بەڵام ئەوەی مایەی ترس بوو کە زۆر لە جێگاکانی تر دەچوو، لە راستیدا هاوشێوەبوو. مرۆڤەکان دێنە دونیاوە و هەوڵدان دەست پێدەکات، دەبێت سەرکەویت، کۆبکەیتەوە، فەنتازیا لە دەوری خۆت دروست بکەی، بگەیتە چین و توێژی تایبەت. جۆن لە پراگ نەدەوەستا، راستەوخۆ دەرۆشت بۆ نوێرمبێرگ لە ئەڵمانیا. کە لێم پرسی دەخوازیت ژنێکی ئەوروپیت هەبێت، وتی کراوەم، بەڵام ئەستەمە من تەنها مانگی ساڵێك دێم بۆ ئەوروپا. بەڵام ناخوازم لە ژیانمدا جارێکی تر زەواج بکەم. پارەی زۆر تێدەچێت. پاش بێدەنگیەکی ماتەمینی وتی، ئەڵمانی بۆئەوەی لە رۆژهەڵات بژی دەبێت کەسێکی تایبەت بێت. دیاربوو خەمی سەرەکی پارە و کەلتور بوو، نەك خۆشەویستی. کە لێم پرسی ئایا پەیوەندی ژن و مێردی بریتیە لە مامەڵەیەکی بازاڕیانە پێش ئەوەی هیچ شتێك بکەن دەبێت بیر لە پارە بکەنەوە، رەنگە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بێباکانە عاشق بێت، بەڵام هەر زوو بە ئاگادێیتەوە کە ژیان زیاتر لە عەشقی پێویستە، ئیتر ئەو بێباکیەت نامێنێت. کە گەشتینە پراگ سەر لە ئێوارێ بوو. کریس پیاوە ئەمریکیە ناشیرینەکە لە ویستگەکە چاوەڕێی دەکردین، ماڵئاوایی سەفەر خۆشیم لە جۆ کرد. لە گەڵ کریسدا رۆشتین بۆ شوقەکەمان لە ناوەندی شار.



## دەنگدانەوەی سەرزەمینێکی تر

«دەنگدانەوەی سەرزەمینێکی تر» ناونیشانی کۆمەڵەچیرۆکێکی خانمە چیرۆکنووس «ئاڤا هوما»یە و «ڕەوەز» لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی و دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بەچاپی گەیاندووە.

ئاڤا هوما لەدایکبووی شاری (سنە)یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ساڵانێکە لە وڵاتی کەنەدا نیشتەجێیە و بە زمانی ئینگلیزی دەنووسێت...

دەنگدانەوەی سەرزەمینێکی تر باس لە ئازار و مەینەتییەکانی ژنان دەکات لە ئێران و دوای چاپبوونی بە زمانی ئینگلیزی دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو لە ئەمریکا. ئەم کتێبە ٧ چیرۆکی لەخۆ گرتووە بە ناوەکانی (یەکێکم لەوان، سۆڵی شووشەیی، کتومت گووگووش، فوارە، ڕووبارێک شیر و هەنگوین، شاڵی ئاوریشم، با سروەیەک کەروێشکە بە قزم بکا).



# ئێوارەکان

## شانۆیی یەك پەردەیی

تەها ئەحمەد ڕەسوڵ

**کاراکتەرەکان :**

**پیاو**

**ژن**

**چەند کوڕوکاڵێک**

( دیمەن سەر ڕۆخی ڕووبارێکە لە زەردەپەڕی ئێوارەیەکدا، پیاو لەسەر بەردێك دانیشتووە و دەڕوانێتە ئاوەکە، دەنگی خوڕەی ئاو لەگەڵ دەنگی بەرز و پڕ هاوار و تریقانەوەی چەند کوڕوکاڵێکدا تێکەڵە کە لە پەڕێکی دوورەوە دێنە بەر گوێ، دەنگە دەنگ نامێنێ و جارجارە خوڕەی ئاو دەبیسترێ )

**پیاو:** ( دەڕوانێتە ئەملاولای) هەموو ئەو قسانە پڕوپووچ بوون، هەمیشە لە سەرەتادا خەڵکی خۆیان ئەنوێنن، وا خۆیان پیشان ئەدەن کە هەرچی پاکیزەیی و بێگەردییە لەواندایە و خاوەنی ناخێکن پێشتر نەبووە، هەموو ئەوەش جگە لە چەکێك شتێکی تر نییە و یەکتری پێ فریو ئەدەن. من وا نەبووم، لەگەڵ هیچ کەسێکدا ئەو



ڕەفتارەم نەنواندووە ( وەستانێك..
تەنها دەنگی خوڕەی ئاو دێت) ئەوەی
کە بووم هەروا خۆم پیشانداوە و
پێویستیم بە خۆ نمایشکردن نەبووە،
بەڵکو من هەرگیز خۆشم پیشان
نەداوە، بەڵکو ئاسایی بووم و ئەوەی
لە دڵما بووە هەمیشە لەسەر لەپم
بووە. ئاوا.. ( ڕووە و ئاوەکە دەستی
درێژ دەکا و لەپی دەکاتەوە) ئەوانیش
بەدرۆوە ئەوە ئەڵێن لەناوەوەشیاندا
کەسێکی ترن.

( دەنگی نەرمە پێ دێتە بەر گوێ،
پیاوەکە لەسەر بەردەکە هەڵدەستێ
و چەند هەنگاوێك دەڕوات.. پشتی لە
شانۆیە و لە جێیەك ڕادەوەستێت)

**پیاو:** خۆشەویستی!! ( برێك
پێدەکەنێت) تەنها خۆ ویستن و
بەکارهێنانی بەرامبەر بۆ حەزێکی
تایبەتی! هەروەك ئامرازێك، منیش
جگە لە ئامرازێکی بەکارهاتوو و
لەکەڵك کەوتوو چیتر نەبووم، کەسێك
کە ئیتر ژەنگ لێیدابێ و کوژابێتەوە،
خۆری لێ ئاوابووبێ و ..... ( دەنگی
نەرمە پێ دێتەوە و شانبەشانی ژنێك
دەردەکەوێت، ڕووە و پیاوەکە دەڕوا و
لە پشتیەوە ڕادەوەستێت)

**ژن:** ئیتر تاریك بووە، لە کەیەوە
من چاوەڕێتم! بۆ ئێواران ئەوەندە
لەسەر ئەم ڕووبارەیت؟! لەکاتی تاریکبووندا گوێ ئاو زۆر سامناکە (
وەستان) ئەو بێدەنگییە ئەمترسێنێت.

**پیاو:** شتێکی باشە هەست بە ترس بکەیت.

**ژن:** بێدەنگییەکی سەیر و پڕ مەترسی!

**پیاو:** ( دوو هەنگاوێك لێی دوور دەکەوێتەوە)
خۆشترین بێدەنگی، ئەڵێی بێدەنگی بەر لە
مێژووە، بەرلەوەی مرۆڤ پێ بخاتە ناو
سروشتەوە و پۆخڵی بکات، بە ناخە
ئاڵۆزە پیسەکەی، بە مەیل و ئارەزووە
نەبڕاوەکانی و بە خیانەتی.

**ژن:** خیانەت!!

**پیاو:** ( تەماشای دەکات) بەڵێ بە
خیانەت.

**ژن:** باشتر وایە لێرە بڕۆین، ئەم
هەستەت هی ئەو کشوماتییەیە، ئەو
تاریکبوونەی دنیا بەرەو کوژانەوە
ئەبات.

**پیاو:** ( دەکەوێتە هاتوچۆکردن)
هەمیشە تۆ هەر شیعرەکانی خۆت
بڵێ، قسەی بە بریق و باق و ڕازاوە،
لە پشت هەموو وشەیەکیشەوە
حەزێکی شاراوە بۆ مەیلە تایبەتییەکان.
دنیات لێ بووەتە شیعر و وا ئەزانیت
کەس لە نهێنی وشەکانت ناگات.

**ژن:** ( دەست دەخاتە سەر شانی) من
لەگەڵ ئەوەدا ڕاهاتووم، حەزیش ناکەم بیر
لەو مەسەلەیە بکەیتەوە، من تۆم ئەوێ و
هیچیتر، بە تەنها تۆ.



**پیاو:** بۆیە کە زانیت هۆی منداڵ نەبوونەکە لە منەوەیە دەستبەجێ گۆڕایت، بە تەنها تۆ بووە دووکەڵی جگەرەیەك و هەر قسە بوو، ژیانمان تەنها قسەیە.
**ژن:** بۆ وا بیرئەکەیتەوە؟! ( وەستان) ئێمە هێشتاکە ئەوەندە بەتەمەن نین هەموو دەرگاکان بەڕوومان‌دا داخرابن، چارەسەر هەیە و پێویستە بڕوامان هەبێت.
**پیاو:** کام چارە؟ من باوەڕم بە هیچ شتێك نەماوە.
**ژن:** ئەڵێم نزیکبوونەوە لەم ڕووبارە لە ئێوارانداا شتێکی خراپە، هەر ئەوەشە وای لێکردوویت بێ باوەڕ بیت، ئێمە هێشتا گەنجین، کوا قسەکانی جارانت؟! من هێشتاکە وەکو خۆمم و لەلام هیچ شتێك نەگۆڕاوە، منداڵ هەبێت یان نا... ئەوە بەشی ئێمە بوو، لە چارەماندا نووسراوە کە وابین، کێ ئەشزانێ سبەی چی ئەبێت.
**پیاو:** سبەینێ بوونی نییە، بە تایبەتی بۆ تۆ، تۆ هەرگیز نایبینیت.
**ژن:** ( بەترسەوە) بۆ نایبینم؟!
**پیاو:** ( دەچێتە سەر ڕۆخەکە) من ئەمرۆم لێ کوژاوەتەوە، ئیتر سبەی چۆن دێت؟! کەسێك ئەمڕۆی نەبێ بێ سبەینێشە.
**ژن:** ئەوە لای تۆ وایە، من باوەڕم بە ئێستایە و بە سبەینێش، ڕابردوو تەواو بووە و لە یادەوەریماندایە، ئای کە خۆش بوو! بۆئەوەی ئێستا و داهاتوومان هەبێت پێویستە درێژە بە کاتەکانی ڕابردوومان بدەین، ئەبێ بەردەوام بین.
**پیاو:** ( بەپەستییەوە) من ئەو بەردەوامییەم ناوێت، درۆ لە





درۆدا، هەست ئەکەم سێبەرەکەم هی خۆم نییە و سێبەری کەسێکی ترە.
**ژن:** لەم قسانە ئەترسم، هەستە با بڕۆین ئێرە زۆر سامناك بووە ( قۆڵ دەکات بە قۆڵیدا)
( دەنگی کوڕوکاڵەکان نزیکدەبێتەوە و ئەوانیش دەردەکەون، پەلکی درەختیان پێیە و لێواری ئاوەکە دەپشکنن )
کەسی یەکەم: لێرەدا ئاوەکە قووڵترە، بۆ هاوین دەیکەینە گۆمی مەلەکردن.
کەسی دووەم: وڵاتانی تر بووایە ئێستا ئەم شوێنە دەکرایە باشترین سەیرانگە، لەکوێ هەوای پاکی وەك ئێرە هەیە، بەڵام ئێرە فەرامۆش کراوە و کەس ساحێبی نییە، خەڵکی هەموو فریای خۆیان ئەکەونز
کەسی سێیەم: چاك فریای خۆیان کەوتوون، ژیانی بۆقەکان لە ژیانی ئەوان خۆشترە.
بەوەش ئەڵێی ژیان! کە ئێوارەی لێدێت وەك مریشك ئەچینەوە ناو کولانەکانمان!
**پیاو:** ( کەمێك ئەچنە ئەولاترەوە و پاشان خۆی لە قۆڵی ڕادەپسکێنێ) تۆ هەرگیز نەترساویت، ئەگەر بترسایتایە! ئەگەر ترست لە دڵدا بووایە ( وەستان) تۆ دڵپاکیی و ساویلکەیی منت بە هەل زانی ( دەنگی خوڕەی ئاو و شەپۆل تاوێك دەخیایەنێت) تۆ هەرگیز سڵت لە من نەکردۆتەوە.. وەك فەرشێکی ڕاخراو بەسەرمدا پەڕیتەوە، من کە ڕاستیی نەخۆشییەکەمم بۆ دەرخستیت ئیتر باکت نەما، ئیتر منت کردە قوربانیی...

**ژن:** ئەوە بۆ چەندەمین جارە ئەو قەوانە لێئەدەیتەوە و ئەشزانیت هەمووی بەتاڵە، تەنها لە مێشکی خۆتدا شت دروست ئەکەیت و گەورەی ئەکەیت.

**پیاو:** ( بەڕەقییەوە) ئەگەر تەنها یەك جار ئێوەم ببینیایە بە شتێکی ئاسایی وەرمئەگرت، بەڵام دووبارە بۆوە.. ئەی نەمبینیت لە کۆڵانەکەدا پێکەوە بوون!.. من چاوی ئێوەم خوێندەوە، ئەشزانیت کە حەز بە بینینی ناکەم.

**ژن:** ( بە کەمتەرخەمییەوە) ئێمە پێشتریش یەکترمان ئەناسی، لەگەڵ خوشکەکەیدا هاوڕێ بووین، ئەوەی کە بینیت تەنها سڵاوکردنێکی ئاسایی بوو و هەواڵی ماڵی ئێمەی پرسی و منیش هەروەها.



**پیاو:** ئیتر لە دوای ئەو ڕۆژەوە هەست بە گۆڕانت ئەکەم، بەڵێ تۆ زۆر گۆڕاویت.. ئەترسم سبەینێ منداڵێك پەیدابێ و بڵێی ئەمە کوڕ یان کچی تۆیە!.. بە بڕوا و ئومێد دەستخەڕۆشم بکەیت، ئای لەو دیمەنە ئاڵۆز و ناخۆشە ( سەری خۆی دەگرێت) ئەو وەختە چ پاساوێك ئەهێنیتەوە کە سەرلەنوێ بچمەوە بۆ عیادەی دکتۆرەکە!.. پێم ناڵێی چ پاساوێك؟! ئیتر کە بۆم ڕوون بێتەوە چاك نەبووم و هەروەکو خۆمم!

**ژن:** ( دوورکەوتۆتەوە)

**پیاو:** ئاوا هەمیشە لەکاتی ڕاستی و شلۆقیدا وا خۆت دەرئەخەیت کە گوێت لە هیچ نەبووە.. نەك بە قسەی من، بەڵکو گوێ نادەیتە قسەی خەڵکیش کە بڕانەوەی بۆ نییە.

**ژن:** ( دەگەڕێتەوە و شەوقێکی سپی ڕووناکیان دەکاتەوە) ئەوا مانگ هەڵهات، چەند دیمەنێکی جوانی هەیە.

**پیاو:** بڕۆرەوە نقوم بەرەوە لەناو شیعر و هۆنراوەکانتا، وەك چۆن بۆ من شتی خەیاڵیی و درۆ و بیانوو ئەهۆنیتەوە.

**ژن:** بیرتە ئێواران پێکەوە ئەمانڕوانییە مانگ و هێشتا نیشانە کرابووین؟! وەرە دەستگیرانەکەم، من ئێستاش هەروەکو جارنم، تۆم خۆشئەوێت، بەڵام ساڵانێکە لە دەمی تۆوە ئەو وتەیەم نەبیستووە، من گۆڕاوم یان تۆ!.. ئەوە تۆیت دنیات لێ هاتۆتەوە یەك، بیستوومە خەڵکی بەچوونە سەر ڕووبار و دەریا خەمەکانیان بەبا ئەکەن، ئەیدەن بەدەم ئاوەوە، کەچی تۆ... ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر ئەبیت، ئەڵێی ئێواران لە گۆڕستانەکەیت، وەرە با بڕۆین، من و تۆ کێمان هەیە لە ژیاندا؟! لەم شارۆچکەیەدا

هەموو ژیانمان بەسەر ئەبەین، وەرە با بەردەوامی بدەینە ژیانمان، سبەینێ دەرگای ئومێدمان لێ ئەکرێتەوە.

**پیاو:** ( بەشپرزەییەوە) سبەی!.. سبەی!.. چەند دڵت بە سبەینێ خۆشە، ڕەنگە سبەینێکان بۆ تۆ هەموو ژووان بن، هەر چاوەچاوی سبەینێتە!

**ژن:** ( لێی نزیك دەبێتەوە) مرۆڤ بە هیواوە ئەژی، ئەگەر باوەڕمان بە سبەینێ نەبێت نازانم بۆچی ئەژین، بەخۆتدا بچۆرەوە.. بگەرێرەوە بۆ یادگارییەکانت، مرۆڤ بێ یادگاری هەڵناکات، مرۆڤ مێژووە، چرکەساتەکانی یەکتر بینینمان بهێنەرەوە یادت، چەند کورتخایەن و دانسقە بوون.. پێویستە هەر بەو یادەوە بژین، بژین و ئەو یادانە زیندوو بکەینەوە.

**پیاو:** ژن هەر خۆشەویستی ئەزانێت، بەڵام لە ڕاستیدا هەر خۆی ئەوێت.. خۆشییەکان تەنها بۆ خۆیان و ... ( وەستان.. دەنگی خوڕەی ئاو) پێشتر هەمیشە هەستم ئەکرد ئافرەت نیشتمانە، پیاوان بێ ژنان هیچ نین و کۆچەری و ڕەوەندین، بەڵام ژنان نیشتمانێکن هەر ڕۆژەی دەسەڵاتێك فەرمانڕەواییان ئەکات.

**ژن:** ئەم قسە بێ سەروبەرانە کۆتایی پێ بێنە.

**پیاو:** بۆچی؟!

**ژن:** سوودی نییە، هیچ مەڵێ و کۆتایی بەو قسانە بهێنە.

**پیاو:** کۆتایی بە قسەکانم یاخود خۆم!!.. ( بەتووڕەییەوە) تۆ ئیتر ناتەوێت گوێت لە دەنگی من بێت، تۆ ئەتەوێت ئیتر بۆ هەتایە بێدەنگ بم و... ( بەرەو ئاوەکە دەڕوات) دەنگم بخنکێنیت، تۆ ئەتەوێت ئەوەی ئەیبینم لەبیر خۆمی بەرمەوە و چاوی خۆم بە درۆ بخەمەوە، نەتوانم ئیتر چ وشەیەك بڵێم و بۆ هەتایە سەرکز و بێدەنگ بمێنمەوە.

**ژن:** ( بەرەو لای دەڕوات و هاژە و خوڕەی ئاو بە بەرزی دێتە بەرگوێ) وەرە با بڕۆینەوە و وەختی چوونە ناو ئاو نییە، با لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدەینەوە.

**پیاو:** ( پەشۆکاوە) گەر ئەتەوێت کۆتایی بە قسەکانم بهێنم، لێرە ئەیبڕێنمەوە، ئیتر با بۆ جارێکی تر گوێت لە دەنگی من نەبێت ( چەند هەنگاوێك دەڕوات)

**ژن:** ( بەدوایدا دەڕوات و لە پشتەوە قۆڵی دەگرێت) نا.. ئەمەوێت گوێم لێت بێت، وەرە بزانم چیت ماوە بیڵێیت، گوێم لێتە.

**پیاو:** ( هەر دەڕوات و بێدەنگە)

**ژن:** ( بە هەنسکەوە) وەرە..ژیانمان بۆ وا تاڵ بووە!.. ئای خوایە! جگە لە تۆ بیرم لە کەسی تر نەکردەوە، مانگی جارێکیش سەردانی ماڵی باوکم ناکەمەوە هەر لەبەر تۆ، تۆش بەو شێوەیە پشتم تێئەکەیت و لە خەیاڵاتی خۆتا ئەژیت.

**پیاو:** ( ڕادەوەستێ و ئاوڕی لێدەداتەوە، بەشێوەیەك لە ترسەوە) خەیاڵات؟!.. ئەوەی من بیری لێ ئەکەمەوە خەیاڵاتە و خۆم دروستم کردووە!.. ئەی پێکەوە نەمبینین قسەتان ئەکرد؟ دوو جار ئێوەم نەبینی؟!

**ژن:** ( بە پاڕانەوەوە) هەر ئەو دوو جارە بوو و تەواو، ئێستا



ئەو ڕۆیشتووە.
**پیاو:** ( بەتووڕەییەوە) بۆ کوێ؟!
**ژن:** سەفەری کردووە، چەند مانگێکە ڕۆیشتووە.
**پیاو:** ( بە دەنگی بەرز) ئەها چۆن دەنگوباسی ئەو ئەزانیت!! ئەشزانیت کە چەند مانگێکە ڕۆیشتووە، ئیتر دڵم لێت کرمێ بووە، لەژێرەوە هەموو شتێکی ئەو ئەزانیت و خۆت دەرناخەیت، تۆ خیانەتم لێ ئەکەیت، تێگەیشتی؟! وا نەزانیت من خەوتووم و ئاگام لە هیچ شتێك نییە، تۆ جگە لە داوێن پیسێك چیدیکە نیت.
**ژن:** ( بە گریانەوە) بمکوژە بەڵام ئەوەم پێ مەڵێ، من تەنها تۆم خۆشئەوێ و بەڵام جارێك، تەنها بۆ جارێکیش بێت لە دەمی تۆوە گوێم لە وشەی خۆشەویستی نەبووە ( قۆڵی دەگرێت و دەنووزێتەوە)
**پیاو:** ناتوانم وەك جاران بتبینم، تۆ گۆڕاویت و ئیتر منیش گۆڕاوم.
**ژن:** چی ئەڵێی بیڵێ، بەڵام هەرگیز کەسم خۆشنەویستووە لە تۆ زیاتر، من خیانەتم لێ نەکردوویت، بمکوژە بەڵام ئەوە مەڵێ.
**پیاو:** پێویستە بکوژرێیت ( پڕی پێدا دەکات)
**ژن:** پێم خۆشە بمکوژیت بەڵام پێم نەڵێی داوێن پیس ( دەگری)
**پیاو:** هەر بە گریان فریوم بدە، هەر درۆم لەگەڵدا بکە، ئیتر ناتەوێت گوێشت لە دەنگم بێت، ئەتەوێت هەست بە هەموو ئەو شتانە بکەم و هەر بێدەنگیش بم!.. ئیتر بێدەنگ ئەبم. ئیتر گوێت لە دەنگی من نابێتەوە هەرگیز ( دەیخاتە ئاوەکەوە و سەری نقوم دەکات، ژنەکە پەلەقاژە دەکا و دەنگی خوڕە تاوێکی شیاو دەخیایەنێت، لەپڕێکدا بێدەنگی... جەستەی ژنەکە سەر ئاو کەوتووە و پیاوەکەش هێشتاکە دەستی لێ بەرنەداوە) هەرگیز.. هەرگیز ( دەلەنگێتەوە و دەنگی دەبێتە نووزە و گریان) ئیتر.. گوێت... لە دەنگی.. من نابێتەوە، ئیتر.. سبەینێ نابینیت ( تەواو دەلەنگێ و دەست بەرز دەکاتەوە) نایبینیت، ئیتر هەموو شتێك تەواو بوو ( دەگری و خۆی ڕاست دەکاتەوە.. دەنگی خوڕەی ئاو بەرزدەبێتەوە، لە پەرێکی شانۆوە ژنەکە دێتەوە سەر شانۆ و لە نزیك ڕۆخەکەوە ڕادەوەستێت)
**ژن:** شوێن نەما بەدواتا نەگەڕێم، بەم ئێوارە وەختە بۆ چوویتەتە ناو ئاوەکەوە؟!
**پیاو:** بۆئەوەی کۆتایی پێ بهێنم! هەموو شتێك تەواو بێت.
**ژن:** ( بە پەشۆکاوییەوە) کۆتایی بە چی؟!! ( بە پەلە بۆ ناو ئاوەکە دەڕوات و قۆڵی



پیاوەکە دەگرێت) وەرە ئیتر درەنگ بووە، ئەم ماوەیە ئەوە چییە سواری کۆڵت بووە؟! تۆ کەی وابوویت؟!

**پیاو:** ( بەشپرزەییەوە) ها؟! ( ئاوڕ بۆ ئاوەکە دەداتەوە) هەمووی خەیاڵ بوو!!.. ئای خوایە ئەڵێی سەرخۆشم! ( بەسەرسوڕمانەوە دەڕوانێتە ژنەکە) تۆ کەی هاتیت؟!

**ژن:** ( چووەتە بن باڵی) ئەی ناڵێم بەدواتا ئەگەڕام! بەم ئێوارەیە بۆ چوویتە ناو ئەو ئاوە ساردەوە؟! خێرا با بڕۆینەوە، لەبەر ئەو کزە ساردەدا نەخۆش نەکەویت.

**پیاو:** ( وەك ئەوەی لە خەوێك ڕابووبێت) باشە.. سەرمامە، بەڵام.. بەڵام خەون و ڕاستی چ جیاوازییەکیان هەیە؟ من چۆن چوومە ئاوەکەوە؟!

**ژن:** باش بوو هاتم، لەو ئاوە ساردەدا وڕێنەت ئەکرد، ئەها وا چۆقە چۆقت پێکەوتووە.

**پیاو:** ( ئاوڕ بۆ دواوە دەداتەوە) بەڵام ئەو هەموو دەنگە، ئەو هەموو جووڵەیە چییە؟

**ژن:** هیچ نییە، خوڕەی ئاوەکەیە، گوێت لە دەنگیەتی؟

**پیاو:** ئا.

**ژن:** با بڕۆین گەرم بیتەوە، ئێواران خوڕەی ئاوەکە لە دەنگی بنیادەم ئەچێت.

تاریکی



رۆمان

# ڕاپۆرتی
گابریێل گارسیا مارکیز

مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: حەمە قادر

Barin_2012

**ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو**
**گابریێل گارسیا مارکیز**
**چاپکراوی غەزەلنووس**

ئەم ڕۆمانەی مارکیز، لەو جۆرانە نییە، کە لە ڕێی نهێنییەوە خوێنەر بە دوای خۆیدا بەکێش بکات، بەڵکوو ڕۆمانێکە، سەرلەهەووەڵ لە ناونیشانەوە، پاشان لە ڕستەی یەکەمەوە، خوێنەر لە ئەنجامی چیرۆکەکە ئاگەدار دەکاتەوە، بەڵام ئیدی ئەوە کارێکی مارکیزانەیە، کە چۆن بەبێ مەتەڵ، بەبێ هیچ نهێنییەک، بەش بەش؛ خوێنەر لەگەڵ خۆیدا دەبات.
ئەم ڕۆمانە کورتەی مارکیز، گەرچی لە چاو سەدساڵ تەنیایی، پاییزی بابسالار و خۆشەویستی لە زەمانی کۆلێرادا کەمتر ناسراوە، بەڵام لە هەرە کارە ورد و پڕتەکنیکەکانیەتی، کە خوێنەر بە خوێندنەوەی سەری لەوە دەسوڕمێت؛ مارکیز چۆن توانیویەتی، یەک ڕووداو، بە چەندان شێوازی جۆراوجۆر بگێڕێتەوە و هەر جارەیش شتێکی نوێتر لە بارەی هەمان ڕووداوەوە بڵێت.
ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو، ساڵی ١٩٨١ چاپ کرا، کە مارکیز تێیدا، گرینگی بە پێوەندیی سوننەتی و ناموسپەرەستیی خەڵکانی ئەمریکای لاتین دەدات. بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە، کەڵکی لە ڕووداوێکی ڕاستەقینەی ساڵی ١٩٥١ وەرگرتووە و بەرگێکی تەکنیکی و ئەدەبییانەی بە بەردا کردووە.
گابریێل گارسیا مارکیز، کە هاوڕێیەکانی پتر بە گابۆ بانگی دەکەن، ساڵێک پاش بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو، خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەبیات پێ ڕەوا بینرا. ڕۆمانی ڕاپۆرتی مەرگێکی پێشوەخت ڕاگەیەندراو، لە زمانی فارسییەوە، لە لایەن حەمە قادرەوە بە کوردی کراوە. ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، بڵاوی کردۆتەوە.

## خۆرکەوتن

«خۆرکەوتن» ناونیشانی کۆی کورتە چیرۆکەکانی «محەمەد فەریق حەسەن»ە، کە نزیکەی نیوسەدە ئەزموونی چیرۆکنووسیی ئەم چیرۆکنووسەی لەخۆ گرتووە و حەوت کۆمەڵە چیرۆکی پێشووی «محەمەد فەریق حەسەن» لەناو «خۆرکەوتن»دا چاپکراونەتەوە.

محەمەد فەریق حەسەن یەکێکە لە چیرۆکنووسە دیارو دەنگە جیدییەکانی نەوەی حەفتاکان و هەر قسەکردنێک لەبارەی ئەو نەوەیەوە بکرێت، ناکرێت باس لەم چیرۆکنووسە نەکرێت و بەسەریدا بازبدرێت... هەر لەبەر ئەمەیە دەزگای سەردەم کۆی ئەزموونی چیرۆکنووسیی ئەم چیرۆکنووسەی لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردووەتەوە و چاپی کردووە، دیارە ئەمەش کارئاسانییەکە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت کار بکەن لەسەر ئەزموونی کورتە چیرۆکی کوردیی ئەو نەوەیە، یان دەیانەوێت ئاگاداری دەنگە دیارەکانی ئەو نەوەیە بن و بەدواداچوونی بۆ بکەن.







2013
دەزگای
چاپ و
پەخشی
سەردەم

# دوژمنایەتی و هاوڕێتیی

میلان کوندێرا

و. لە ئینگلیزییەوە: خەزاڵ



لە ڕۆژێکی سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ دا، لەکاتی داگیرکردنی وڵاتەکەمان لەلایەن ڕوسیاوە، هەردووکمان من و ژنەکەم کە لە کار دەرکرابووین و تەندروستیمان خراپ بوو، چووینە نەخۆشخانەیەك لە دەوروبەری پراگ بۆ بینینی دکتۆرێکی زۆر باش کە هاوڕێی هەموو هەڵگەڕاوەکان بوو، ئەو کەسەش پیرە پیاوێکی حەکیمی جوولەکە بوو کە بە پرۆفیسۆر سماهێل بانگمان دەکرد. لەوێدا .E مان بینی، دیاربوو ئەویش تەندروستی خراپ بوو، هەر چوارمان دانیشتین و دڵخۆشبووین بەو هەستی دۆستایەتییەی نێوانمان و ماوەیەکی درێژ پێکەوە قسەمانکرد.

.Eئێمەی گەیاندەوە شار و دەستیکرد بە قسەکردن لەبارەی بۆهومیل هرابال، بۆهومیل لەوکاتەدا گەورەترین نوسەری زیندووی چیکی بوو: پیاوێك بوو خاوەن خەیاڵێکی بێسنور بوو، جۆش و خرۆشێکی زۆر و خاوەن ئەزموونێکی ژیانی ڕەشۆکیانە بوو «ڕۆمانەکانی پڕبوون لە کەسە هەرە ئاساییەکان»، زۆر خوێنرابوەوە و زۆریش خۆشەویست بوو، «تەواوی شەپۆڵی فیلمسازانی گەنجی چیکی وەك قدیسی سایەداری هونەرەکەیان عاشقی بووبوون». ئەو بێ ئەندازە ناسیاسی بوو، لە ڕژێمێکدا کە «هەموو شت سیاسی بوو»، ئەمە بێگوناهانە نەبوو: هەڵوێستی ناسیاسیانەی ئەو گاڵتەکردنێك بوو بەو جیهانەی کە ئایدۆلۆژیاکان ئاژاوەیان تیادا ئەسازاند. لەبەرئەمە تا ڕادەیەك هەستی بە شەرمەزاری ئەکرد. «ئەم بارەش بۆ هیچ کەسێکی فەرمی نەئەگونجا»، بەڵام هەر بە هۆی ئەو هەڵوستە ناسیاسیەیەوە «کە بەئاشکرا لە دژی ڕژێم قسەی نەئەکرد»، لەکاتی داگیرکردنی ڕوسیادا وازیان لێ هێنابوو، ئەمەش وای کردبوو بە جۆرێك لە جۆرەکان بتوانێت چەند کتێبێك چاپ بکات.



زۆر لە بۆهومیل هراباڵ توڕەبوو، ئەیووت: ئەو چۆن ئەبێت E. ڕێگا بدات کتێبەکانی چاپبکرێن لەکاتێکدا هاوپیشەکانی ڕێگەی بڵاوکردنەوەیان لێگیراوە؟ چۆن دەتوانێ بەم شێوەیە شەرعیەت بەم ڕژێمە بدا؟ بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەکی ناڕەزایی دەرببڕێت؟ ئەم کارەی هراباڵ قێزەونە و پیاوێکی خۆفرۆشە.

کاردانەوەی من لەبەرامبەر تووڕەبوونەکانی ئەودا وەك ئەوەی ئەو وابوو، بەڵام من ئەمووت: چەند بێمانایە باسی خۆفرۆشی بکرێ لەکاتێکا ڕۆحیەتی کتێبەکانی هراباڵ و قۆشمەیی و خەیاڵەکانی تەواو پێچەوانەی ئەو عەقڵییەتەیە کە حوکمی ئێمە دەکات و دەیەوێ لەڕێگای کۆت و بەندەکانییەوە بمانخنکێنێت! لەو دنیایەدا کە هراباڵی تیادا ئەخوێنرێتەوە تەواو جیاوازە لە دنیایەك کە دەنگی ئەوی تیادا نابیسترێت! تاکە کتێبێکی هاراباڵ لەبەرامبەر هەموو کار و ئامەژە و خۆپیشاندانەکانی ئێمەدا ئەوەستێتەوە لەبەرامبەر خەڵکی و بیرکردنی ئازادیدا! گفتوگۆکەی من و ئەو لە ناو ئۆتۆمبیلەکەدا خێرا بوو بە دەمقاڵێیەکی تاڵ لەگەڵ یەکتریدا.

دواتر کە بیرم لێکردەوە سەرسامبووم بەو ڕقە «ڕاستەقینە و تەواو دوولایەنییە»، بەخۆمم وت: کەوایە هارمۆنیەتەکەی ئێمە لە عیادەی دکتۆرەکە کاتی بوو، پەیوەندی بە کۆمەڵێك بارودۆخی مێژوویی دیاریکراوەوە هەبوو کە هەموومانی کردبووە قوربانی چەوساندنەوە؛ هەرچی ناکۆکیەکانیشمان بوو بووبووە جەوهەرێك بۆ ڕزگاربوون لەو بارودۆخە، بریتیبوو لە ڕێکەوتنی کەسانێك لەگەڵ یەکتریدا کە خەباتی سیاسی بۆ ئەوان لە ژیانی ڕاستەقینە و هونەر و بیر گرنگتر بوو. لەبری ئەوەی تەواوی مانای سیاسەت خزمەتکردنی ژیانی ڕاستەقینە و هونەر و بیر بێت. ئەم دوو هەڵوێستە دەکرێ هەر یەکێکیان لۆژیکیبن، بەڵام بەیەکتری ناگەن.

لە پایزی ساڵی ١٩٦٨ دا دوو هەفتەم لە پاریس بەسەربرد، بەختداریشبووم کە دوو یا سێ گفتوگۆی درێژم لەتەك لوی ئاراگۆن ببێت لە ئەپارتمانەکەی خۆی لە شەقامی ڤارێن. من بۆ خۆم زۆر قسەم نەکرد و تەنها گوێم ئەگرت، لەبەر ئەوەی کە من یاداشتی ڕۆژانە نانووسمەوە، ئێستا یادەوریم لەبارەی ئەم گفتوگۆیەوە زۆر ڕوون نییە؛ لە قسەکانی ئەودا تەنها دوو تێمای یەك بەدوای یەکم بیردێتەوە: بەڕادەیەکی باش باسی ئەندرێ بریتۆنی کرد، بەتایبەتی ئەو کاتەی نزیك بە کۆتایی ژیانی بوو، دیاربوو دووبارە پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا دروستکردبووەوە. هەروەها باسیشی لە هونەری ڕۆمان کرد. تەنانەت لەو پێشەکییەدا کە مانگێك بەر لە یەکتربینینمان بۆ کتێبەکەم «نوکتە» نوسیبووی، بەم شێوەیە ستایشی هونەری ڕۆمانی کردبوو: «ڕۆمان بۆ ئینسان شتێکە نابێت دەستبەرداری ببێت چونکە وەك نان وەهایە». لەماوەی سەردانەکانمدا بەردەوام هانیدەدام هەمیشە بەرگری « لەو هونەرە « بکەم، «وەك لە پێشەکییەکەیدا بەو «هونەرە بەهادابەزیوە» ناوی بردبوو؛ من دواتر ئەم دەربڕینەم وەك ناونشانی باسێکی کتێبی «هونەری ڕۆمان» بەکارهێنا. لەدانیشتنەکەماندا ئەو هەستەم لەلا دروستبوو کە هەرە هۆکاری گرنگی جیابوونەوەی

ئاراگۆن له سرياليیەکان هیچ هۆکاریکی سیاسی لەپشتەوە نەبووە و هۆکاری «گوێڕایەڵی ئەو نەبووە بۆ پارتی کۆمیونیستی»، بەڵکە هۆکارەکە هۆکارێکی جوانناسی بووە «وەفاداریی ئەو بووە بۆ ڕۆمان، ئەو هونەرەی کە «بەهای دابەزێنرابوو» لەلایەن سورياليیەکانەوە. هەستم بەو جوت تروسکە درامایەی ژیانی ئەکرد: عەشقی ئەو بۆ هونەری ڕۆمان «کە ڕەنگە گرنگترین بواری بەدیکردنی بلیمەتی ئەو بێت» هەروەها هاوڕێیەتی لەگەڵ بریتۆن. «ئێستا تێدەگەم: کاتێك ئینسان بەخۆیدا ئەچێتەوە، ئازاراویترین برینێك کە ببینێت برینی لەیەکترازانی دۆستایەتییە، هیچ شتێك لەوە گەمژەتر نییە هاوڕێیەکت بکەیتە قوربانی سیاسەت. من شانازی ئەکەم کە قەت ئەوەم نەکردووە. من بە وەفای مێتران سەرسام بووم بەرامبەر کۆنە دۆستەکانی.
هۆی ئەو دڵسۆزییەشی بوو وایکرد لە ئاخر و ئۆخری ژیانیدا ئاوا بە توندی هێرشی بکرێتە سەر. ئەو وەفادارییە خانەدانیەکەی ئەو بوو».
حەوت ساڵ دوای بینینی من و ئاراگۆن، بە ئیمێ سێزێر ئاشنابووم، ڕێك دوای جەنگ ئاگاداری شیعرەکانی بووم لە ڕێی وەرگێڕانی چیکییەوە لە گۆڤارێکی ڕوانگەییەوە «هەمان ئەو گۆڤارەی میلۆشی پێناساندم». ئەمەش لە پاریس ڕویدا لە ئەتێلیێەکەی شێوەکار «ویلفرێدۆ لام». ئیمێ سێزێر، کەسێکی گەنج و ڕووخۆش و سەرنجڕاکێش بوو، منی بە لێشاوێك پرسیار داگرتەوە، یەکەمینیان وتی کۆندێرا، نێزڤەل دەناسی؟» ـ بەڵێ، بەدڵنیاییەوە. بەڵام تۆ چۆن دەیناسیت؟ ئەو، نێزڤەلی نەناسیبوو، بەڵام لە ئەندرێ بریتۆنی بیستبوو کە زۆر باسیکردبوو. بەگوێرەی ڕا پێشوەختانەکانم، دەکرا وابیربکەمەوە کە ئەندرێ بریتۆن، بە خۆی و نابانگە زۆر و سەرسەختیەکەیەوە دەکرا تەنها بە خراپە باسی نێزڤالی کردبێت، چەند ساڵێك لەوەوپێش لە سورياليیەکانی چیك جیاببویەوە و وەك ئەراگۆن شوێن بڕیارەکانی حیزب کەوتبوو.
کەچی ئەو باسی کرد و وتی ئەو کاتەی بریتۆن لە ساڵی ١٩٤٠ لە مارتینێك بووە زۆر بە خۆشەویستییەوە لەبارەی نێزڤەلەوە دواوە. لەبیرمە ئەم قسەیە هەستی منی زۆر بزواند، چونکە نێزڤەلیش هەمیشە بە خۆشەویستییەوە باسی بریتۆنی دەکرد.



ئەوەی بۆ من مایەی زۆرترین شۆکێك بوو لە دادگا بەناوبانگەکانی ستالیندا، ئەو خوێنساردی و ڕەزامەندییە بوو کە کۆمیونیستەکانی دەوڵەت لە سێدارەدانی هاوڕێکانیان پێ قبوڵدەکرد. چونکێ هەموویان هاوڕێ بوون، مەبەستم ئەوەیە لە نزیکەوە یەکدییان ناسیبوو، لە ڕۆژگارە قورسەکاندا پێکەوە ژیابوون، لە کۆچ و چەوساندنەوە و خەباتێکی سیاسیی دوور و درێژ پێکەوەبووبوون. بەڵام چۆن توانییان بەم شێوە ترسناك و یەکلاکەرەوەیە قوربانی بە هاوڕێیەتییان بدەن؟ بەڵام ئایا هاوڕێتیی چییە؟ پەیوەندییەکی مرۆیی هەیە لە زمانی چیکیدا پێیدەوترێ **soudruzustvi** کە لە **soudruh** هاتووە، هاوڕێ «بە مانای دۆستایەتی هاوڕێ و یاوەران»دێت، ئەو هەستە هاوبەشەی ئەوانە پێکەوە دەبەستێتەوە کە لە هەمان خەباتی سیاسیدان. کاتێك ئەو دڵسۆزییە هاوبەشە نامێنێت، هۆکاری هەستە هاوبەشەکەش نامێنێت. بەڵام ئەگەر هاوڕێیەتییەکە لە خوار سودێکەوە دابنرێت ئەوا ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە هاوڕێتییەوە نییە.

لە سەردەمی ئێمەدا خەڵکی فێربوون بە تۆنێکی شانازیکەرانە بەئەخلاقەوە و بێ هیچ چەندوچوونێك هاوڕێیەتی بخەنە ناو ئەو خانەوەی کە پێی ئەوترا «تاوانبارکردن».

بۆ تێگەیشتن لەو ڕایەی کە ئێمە مشتومڕی لەسەر ئەکەین کامڵبوونێکی لە ڕادەبەدەری پێویستە بۆ ئەوەی لەو گریمانانە تێبگەین کە بەلامانەوە پەسەندن، کە هەم بە مسۆگەری کەموکوڕی تیایە و پێشدەچێت تەواو کاتی بێت، دەنا ئەوە تەنها عەقڵی سنووردارە ئەو گریمانانە وەك یەقین و حەقیقەت ئەبینێت. ئەمە جیاوازە کە دڵسۆزی منداڵانە بۆ باوەڕێك، دەنا وەفا بۆ هاوڕێیەك فەزیلەتە، ڕەنگە تاکە فەزیلەش بێت، تاکە چاکەیەکبێت کە مابێتەوە.

من سەیری ئەو فۆتۆیەی ڕێنێ چاری شاعیر دەکەم کە بە تەنیشت هایدگەرەوەیە. یەکێکیان وەکو بەرهەڵستکارێکی فەرەنساوی داگیرکاریی ئەڵمان ناسراوە و ئەویدیکەیان لە قۆناغێکی ژیانیدا ناوی خۆی لەکەدارکردووە لەبەرئەوەی هاوسۆزبووە بەرامبەر سەرەتاکانی نازیزم. فۆتۆکە بۆ ساڵانی دوای جەنگ دەگەڕێتەوە. هەردووکیان لەدواوە وێنەیان گیراوە و کلاویان بەسەرەوەیە، فیگۆرێکییان درێژ و ئەویدیان کورت، لە دەرەوە پیاسە دەکەن. من زۆر ئەو فۆتۆیەم خۆشدەوێ.

سەرچاوە:

Encounter Essays by Milan Kundera

پەراوێز:

١. کوندێرا نەیویستووە ناوی هاوڕێکەی ببات و تەنها حەرفی **E**. بۆ داناوە.

٢. هرابال: نوسەرێکی چیکییە، ساڵی ١٩٩٧ مردووە، چەندین ڕۆمانی نوسیوە وەك «تەنهاییەکی دەنگ بەرز، کۆڵانێکی ون، وانەی سەماکردن بۆ بەساڵاچووان، ئەم ڕۆمانەیان بە یەك ڕستەی درێژ نوسراوە».

٣. ئیمێ سێزێر : شاعیر و نوسەر و سیاسی فەرەنساوی، لە ٢٠٠٨ مردووە، ئیمێ نوسیویەتی:
کێ لە ئێوە هەرگیز نەیکێشاوە بە زەویدا بەبۆنەی خراپیی دانیشتوانەکەی؟
ئەمڕۆ من لەو تاقە سپێتیەدا ڕادەوەستم کە ئینسانەکان هەرگیز لە مندا نەیانبینیبێ.
ئیمێ ڕەشپێست بووە و یەك لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی **Negritude** بوو کە نوسەر و ڕۆشنبیر و سیاسیە ڕەشپێستەکانی ناوچەی فەرەنسی زمان لە سییەکانی سەدەی بیست دروستیانکردووە، جۆرە یەکبوونێکیان لە شوناسی ڕەشپێستبوونیان بەدیدەکرد دژی ڕەتکردنەوەی کۆڵۆنیالی ڕەگەزپەرستی فەرەنسایی.

٤. میلۆش: نوسەر و وەرگێڕی پۆڵەندی لە ١٩٨٠ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە و لە ٢٠٠٤ مردووە.



میلۆش لە دەقی کاتژمێرێك دەنوسێت:

گەڵاکان لە خۆردا دەدرەوشێنەوە، ویزەویزی بەپەرۆشی هەنگەکان لە دوورەوە دێت
لە جێگایەکدا لە پشتی ڕووبار، زایەڵەی دەنگە بەردەوامەکان و
دەنگی بەکاوەخۆی چەکوشێك دێت کە تەنها هەر خۆشیی نابەخشێتە من
بەر لەوەی پێنج هەستەکە ئاوەڵابن و زووتر لە هەر سەرەتایەك
ئامادەبن، چاوەڕێی هەموو ئەوانەیان دەکرد بە خۆیان دەڵێن فانی،
بۆئەی بتوانن ستایشی ژیان بکەن، وەك من، ژیان کە شادییە.

٥. نێزڤەل : نوسەری ڕوانگەیی چیکی کە لە ١٩٥٨مردووە. یەکێ لە دامەزرێنەری قوتابخانەی سوریالی چیکیی بووە.

Literature of neighboring countries

# چەند
# کورتە چیرۆکێکی
# زۆر کورتی
# چەند نووسەرێکی
# ئێرانی



ئەدەبیاتی وڵاتانی دراوسێ

ئەدەبی سەردەم



# چەند کورتە چیرۆکێکی زۆر کورتی چەند نووسەرێکی ئێرانی

**و. لە فارسییەوە: هیوا خەیات**



## شەرم

شوشە شکا و بەردەکە کەوتە ژورەوە  بەردەکە شەرمی دەکرد لە کاری ئەو کەسەی کەهەڵیداوە.

**محسن سعیدالسادات**

## پیرەمێرد

سواری پاسەکەبووم شوێنی دانیشتن نەمابوو، ناچاربووم بە پێوە بووەستم، پیرەمێردێکیش لەتەنیشتمەوە وەستابوو لە بەرامبەرمان لاوێك دانیشتبوو. لە دڵی خومدا وتم: ئەگەر من بومایە لەجێی ئەو لاوە هەڵدەستام بۆ ئەوەی ئەو پیاوە پیرە دابنیشت، ڕێك لەوەکاتەدا لاوەکە هەستاو فەرمووی لێکردم لە شوێنەکەی ئەو دابنیشم، کاتێك دانیشتم تێگەیشتم خۆمنیش پیربووم.

## شوشە

هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێکانی لەبەردەم ماڵی پیرەژنەکەدا تۆپانێیان دەکرد، هەرجارێك تۆپەکەیان دەکەوتە حەوشی ماڵی پیرەژنی دراوسێیان، پیرەژنەکە تۆپەکەی ئەدانەوە و دەیوت: کورەکەم، بڕۆن لە وپارکە یاریبکەن. ئەو ڕۆژەیش دیسان تۆ پەکە کەوتەوە ماڵی پیرەژن، دەنگی شکانی شوکەکە هات، مناڵەکە هەرچی بزەی کرد بۆ نەوە بچوکەکەی پیرەژن ئامادەنەبوو تۆپەکەی بداتەوە، کە شەو داهات دەنگی شکانی شوشە هات و منداڵەکە تۆپەکەی لەناوژورەکەی خۆیان بینیەوە.

**ترمە میرەادی زادە**

## پاسکیل

یەکەمین شیعرم کەچاپبوو باوکم پاسکیلێکی بۆهێنام. دەوەمین شیعرم چاپکرا پۆلیس باوکمیان برد.

**اکبر اکسیر**

## ونبون

کە ڕۆژنامەکەم کردەوە وێنەی خۆم بینی لەلاپەرەی ونبوەکاندا، کاتێك پەیوەندیم کرد بەژمارە تەلەفونەکەی ژێر وێنەکەوە. تەلەفۆنەکە مەشغوڵ بوو.

**محسن محمودیان**



## ترس

لە نوقمبوون زۆر ئەترسا
هەرچی دەست و پەلی کوتا سودی نەبوو.
یەکسەر بۆ بنی بنەوە نوقم دەبوو
کە ترسەکەی شکا، هاتەوە سەرئاوەکە.

**حسن پرس**

## دەردە دڵ

ناچاربوو بچوك ببێتەوە تاوەکو ئەوانی تر گەورە بن.
لای دۆستەکەی دەردەدڵی کرد، دۆستەکەی وتی: منیش خاڵی دەبمەوە تا ئەوان پڕببن.
ئاوایە چارەنوسی قەڵەم دار و پاندان.

**حمید کریمی**

.

## چارەنوس

بەپەلە و خێرا دەڕۆیشت.. جێپێکانی لە سەر ڕووی بەفرەکە جێدەمان، بەڵام کاتێك پەشیمان بووەوە، ڕێگاکەی نەدۆزیەوە، بەفرەکە ببووەوە بەئاو.

**سعیده شفقت خامنەی**



## خۆزگە

وتی: ڕاستییەکەی زۆر خۆشیم لەکرم دێت، هەڵبەتە دەزانم لات سەیرە بەڵام... چۆن بڵێم عاشقیانم
لەو کاتەدا لە ناکاو بزەیەکی کرد، لە چکەکەی ڕێککردەوە و وتی بونەوەرێکی زۆر سەیرن زۆر خۆشیم لێیان دێت.
پاشان بەبێ خودا حافیزی ڕۆیشت.
هەروا لە سەر سەکۆکە دانیشتبووم،
باران خەریکبوو وردە وردە ئەباری،
بیرم دەکردەوە خۆزگە کرم دبووم.

**سیدشهابدین میر شاول**

# زەردە خەنە

دوێنی بڕیاریدا ئیتر خەم بۆکەس نەخوات و بۆ هیچ شتێك نەگری. بیری لەو کێشانە کردەوە کە بۆیان خەمبار بووە، ئەوەندە پێکەنی فرمێسك بەچاوانیا هاتنەخوارەوە.

**حامد بهەشتی**




# چاوشارکێ

لەپیادە ڕەوێکی قەرەباڵەغدا شانی بەر شانی کەسێك کەوت، بۆ ماوەیەك نەیتوانی چاوی لە سەر هەڵبگرێت، بیری کەوتەوە هاوڕێیەکی منداڵییەتی کە لەیاری چاوشارکێدا ونی کربوو.

**ئەرخەوان سادات احمدی**

# ئەگەر

چوار کاتژمێرە خەریکی نووسینی قۆپییەکە لەسەر کاغەزێکی بچوك. ئەگەر دوو کاتژمیر بەو دیقتەوە وانەکەی بخویندایەتەوە نیوەی کتێبەکەی ئەز بەر کردبوو.

**مریم فرهمند**

# شەرمەزار

دایە گەورە  توانای  بەرێدا ڕۆیشتنی نەمابوو، هەموان لێی  توڕە ئەبوون، دایە گەورەیش خەجاڵەتی ئەکێشا. ئەو ڕۆژە نەوەیەکی بردی بۆ پارك، لە کاتی گەڕانەوە بۆماڵەوە  لەپێ کەوتبوو نەیدەتوانی بڕوات، نەوەکەی بەشەرمێکەوە بۆی دەڕوانی. کاتێك کە ئەو منداڵ بوو هیلاك ئەبوو نەیئەتوانی بڕوات  دایەگەورە ئەیکردە باوەشی، بەڵام ئیستا ئەم نەیئەزانی چی لە دایەگەورە بکات.

**ترمەمیرهادی زادە**

# لەخەودابوین

گومانم ئەکرد دایکم ماوەیەکی زۆرە نەخۆشە.
بەڵام نەیدەهێشت
ئێمە هەستی
پێبکەین.
کاتێ ئەمڕۆ
سەیری



پشکنینەکانیم

کرد تێگەیشتم چییەتی، بێچارە دوینێ شەو مرد و ڕزگاری بوو، نازانیین سەعات چەندبووا؟ بەیانی ئەو کاتە زانیمان مردوە کە لە کاتی خۆیدا نانی بەیانی ئامادە نەکرابوو.

**پوران حجت انیّاری**

# دڵی شوشە

کاتێك لای هاوڕێکانم وتم شوشە دڵی هەیە، هەموان پێم پێکەنین، بەڵام من بە چاوی خۆم بینیم  ڕۆژێکی سارد شوشەی پەنجەرەکە هەڵم گرتبوی لە سەریم نووسی (چەندە تەنیام) بۆم گریا.

**ناهید دالاهی**

سەرچاوە:
داستانك ها
گزین گویەهای ادبی
تدوین علی رچا پور امید

شاعیرە داهێنەرەکان هەمیشە بریندارانە بە ژیاندا تێ ئەپەڕن، کەمن ئەو شاعیرانەی ئەتوانن برینداری خۆیان بخەنە ناو ئێمەوە یان بیرمانبخەنەوە کە ئێمە بریندارین، شێرکۆ بێکەس یەکێکە لەو شاعیرە دەگمەنانەی کە لە ڕێی مانا شیعرییەکانییەوە لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ژیانماندا برینداری کردوین و بیریخستوینەتەوە کە ئێمە چەندە بریندارین. سەرەتای شیعریی شێرکۆ بێکەس سەرەتایەکی تەنها و تایبەت نەبوو بەڵام ئێستا سەرباری بوون بە خاوەنداریێتی لە ئەزمونی شیعریی خۆیدا تەنهایانە درێژە بەو ئەزمونەی خۆی ئەدات و لەگەڵ وەچەکانی تردا ئەڕوات و لەگەڵیاندایە، ئەگەرچی مانای شیعریی و قەلەقی شیعریی ئەو لەگەڵ زەمەن و ئەزموونەکاندا ئەگۆڕێت، بەڵام بە هەمان نەفەسی شۆڕشگێڕانەوە ڕێ ئەکات.
شێرکۆ بێکەس سەرباری ئەوەی دیدێکی شۆڕشگێڕانەی هەیە بۆ کوردبوون، بەڵام شیعری خۆی نەکردۆتە قوربانی تەنها دیدێک، گەر بتەوێت کێرڤی ڕەزم و ئیقاعی ناو شیعری شێرکۆ بێکەس ببیستیت ئەبێت پێش هەرشت مانا فەرامۆشبکەیت و تەنها ببیستیت، ئەو کاتە هەست بەو ئیقاعە بە هەڵپە و چەند ڕەزمییە توندە ئەکەیت کە بۆتە مۆسیقایەکی هەمیشەیی ناو دنیایی شیعری ئەو. تەنها ئەو کاتانەش ئیقاعی ئەو مۆسیقایە ئەگۆڕێت کە لەناو یادەوری تراژیدیادا خەمبارە و ئەو کاتانەی کە واز لە «ئێمە»ی شیعری دێنێت و باس لە «من»ێکی شیعری دڵشکاو ئەکات و لەناو یادەوەری خۆیدا غەرقە و سەری ناپەرژێتە سەر کەسی تر. باشترین نموونە بۆ ئەو ئیقاعە هێمن و خەمبارە لە شیعرەکانی «پایز لەناو پایز و دایکم»ی ناو دیوانی «خێراکە، مردن خەریکە بگات».
شێرکۆ بێکەس تەنها شاعیری کوردە ڕۆژانە بنووسێت، ئەم دەگمەنییە ئەگەرچی لە ئاستی شیعریدا توشی دووبارەبوونەوەی ئەکات، بەڵام لە ئاستی ڕۆحیدا بۆخودی خۆی هەمیشە وەک شاعیرێک ئامادەی کردووە بۆ بەردەوامی. ئەو تاقە شاعیری کوردە بەو هەموو هێز و وزە شیعریەیەوە بەردەوام ئەنووسێت، شیعری شێرکۆ بەشی شێری بەرئەکەوێت لە دروستکردنی «ئێمەیەکی شیعریی»، «ئێمەستان» لە خولقاندن و دروستکردنی دنیای شیعری ئەوە، گرنگ نییە لە ئێستادا ئێمە لەبەردەم ئەو دنیایەدا چەندە سەرسامین یان نا، بەڵام هەریەک لە ئێمە لە قۆناغە جیاوازەکانی شیعری ئەودا، «من»ی خۆی دۆزیوەتەوە و کەم تا زۆر ڕێی بەخۆیداوە ببێت بە هاوڵاتییەکی ئەو مەملەکەتە شیعرییەی ئەو. دان پیانان بەم ڕاستییەدا ئەخلاقیەتێکی ئینسانی و ئەدەبییە، ئەوەشی دان بەم ڕاستییەدا بەهەرچ بیانوویەکەوەبێت نەنێت، بەدەستی خۆی خۆی ئەخاتە دەرەوەی ئەو بازنە مۆراڵییەی کە ئەدەب داوامان لێ ئەکات. دیارە ئەم ئەزموونە ئەدەبییە تایبەتیانەی هاوجۆری ئەزمونی شیعری شێرکۆ بێکەس لەناو زۆرینەی ئەو میللەتانەدا هەن کە خەونی شوناس و پرسیاری نەتەوەییان هەیە، بۆیە وردبوونەوە لەم ئەزموونانە گرنگی زۆری هەیە بۆ دروستکردنی ئەو کلاسیکییەتەی کە ئەدەب پێویستی پێیەتی.
بەشێکی گەورەی برینداری شاعیرە داهێنەرەکان لە خەمی زوو تێپەڕینی کات و کورتی ژیانەوەیە، ناونیشانی ئەم کۆ شیعرەش ڕەنگە هەر لەم سۆنگەیەوەبێت، کە ڕەنگە ناونیشانی «خێراکە، مردن خەریکە بگات» یەکێک بێت لە شاعیرانەترین ناونیشانی کتێبە شیعرییەکانی شێرکۆ بێکەس. بەڵام لەگەڵ کورتی ژیاندا ژیانی شاعیران و نووسەرانی داهێنەر سەدان بەرابەری ژیانی کەسانی ترە، چونکە ئەوان بەو ژیانە کورتەوە فریای وتنی ئەو هەموو شتانە ئەکەون کە هەزاران کەس بەو ژیانە کورتەدا تێ ئەپەڕن و هەمووان پێکەوە ناتوانن هێندەی نیوەی شاعیرێک بڵێن و هێندەی چاوی شاعیرێک ببینن. ژیان کورتە، بەڵام ژیانی داهێنەران زۆر درێژە، درێژتر لەو ژیانە کورتەی لەسەر ئەم ئەستێرە شینە بەسەری ئەبەن.

## پاولۆ کۆیلۆ

# سەما لەگەڵ فریشتەکاندا دەکات

**سازدانی دیدار: ڤالێری رایس**
**و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن**

پایزی پار بوو، کە من لەسەر ئینتەرنێت پەیوەندیم بە پڕ فرۆشترین نووسەری برازیل ـ ی کرد، خاوەنی رۆمانی «کیمیاگەر» و دەیەها رۆمانی دیکەی بەناوودەنگ، من واقم وڕماو بووم لەبەردەم وەها بە جیهانیبوونێکی بەربڵاوی ئەم نووسەرە. لە نیویۆرك و لە هۆتێلەکەی خۆی بوو لە «میلان» کە یەکدیمان دواند، لە هەموو لایەکەوە عاشقانی ئەدەبەکەی بە پرسیار گەمارۆیان دابوو، لە میسر ـ ەوە بۆ سوید و ئیسپانیا و ئێران و شوێنانی دیکە. هەمووان دەیانخواست بزانن کە لە کام سەرچاوەو لە کوێوە بیر و خولیاکانی بۆ دێت، خوو و خدە



و هەڵسوکەوتی چ جۆرێکە، داوای ڕێنماییان لێدەکرد کە ئەوانیش چۆنچۆنی بە دوای گەنجینەی شاراوەی نێو زاتی خۆیاندا بگەڕێن و بیدۆزنەوە. ناوبانگی سەرسامکەری پاولۆ کۆییلۆ لە کتێبەکانییەوە هاتووە کە بۆ شەست و سێ زمان وەرگێڕدراون، لە هەموو شوێنێکدا دڵی خوێندەوارانی بە لای خۆیدا راکێشاوە، زۆر بە قووڵی، زۆر بە سادەیی لە ڕێگەی ئەو پەیامە رۆحانییانەی خۆیەوە خەڵکی لە دەوری خۆی کۆ کردۆتەوە.

ئەو نووسەرە تەمەن پەنجا و نۆ ساڵە و زێدە خۆشەویستە بە هەوەسی خۆی حەزی کرد بمباو بمهێنێت، ئەوەبوو بەم دواییە لە ماڵەکەی خۆیدا و لە «پاریس»ەوە زەنگی بۆ لێدام بەو نیازەی کە سەبارەت بە دوا کتێبی قسان بکەین: کتێبی «جادووگەرەکەی پۆرتۆبیللۆ»، قسە لەسەر ئەوەی لەبەرچی حەز دەکات سەما بکات، باسوخواسێك لەمەڕ «کەتالۆسیزم»ە دژوار و پڕ لە قرتوپرت و دوودڵییەکەی، یان بۆچی زۆر گرنگە باوەش بۆ خۆشەویستی بکەینەوە هەتا گەر خودی خۆشەویستی ببێتە مایەی دەردەسەری و ئازار و تلانەوەش.

چۆن بڕیارت دا کە سەبارەت بە جادووگەر بنووسیت؟

پاولۆ کۆییلۆ: یەکەمجار بیرم لەوە دەکردەوە بە وردی شتێك سەبارەت بەو لایەنە و دیوی مێینەیی کە لە خوداوەند ـ دا هەیە بنووسم. شتێکە کە ئێمە بایەخێکی زۆری پێنادەین، بە لایەنی کەمەوە لە نێو شارستانییەتی خۆماندا. سێ ئایینە سەرەکی و بەربڵاوەکە ـ مووساپەرستی، عیساپەرستی و ئیسلام ـ بە جۆرێك لە جۆرەکان نکوڵی لەوە دەکەن کە خودا بۆ خۆی رەهەند و ڕوویەکی مێینەیی هەبێت. هەر چۆنێك بێت، گەر ئێوە بچنە ناو دەقە پیرۆزەکان، لەوێدا ئامادەگییەکی مێینەیی ـ فێمینی ـ دەبینن. دووەم پاڵنەر بۆ ئەم هەوڵەم خواستێك بوو بەوەی بتوانم ئەم بابەتە بە واقیعێکی بەرچاو و بەرجەستە ببەستمەوە، بەو مانایەی کە هەست بکەین بە چواردەوری ئێمەوە چی دەگوزەرێت. بۆ من هەموو شتێك پیرۆزە، سەرەتا بەم سەر زەمینەوە دەست پێدەکەم، بەڵام دەچمەوە سەر پیرۆزکردنی هەموو ئەو شتانەش کە بە دەستی مرۆڤ دروست کراون.

دوا جار..کتێبی «جادووگەری پۆرتۆبیللۆ» سەبارەت بە خەڵکانێکە کە دەوێرن چەند هەنگاوێك بنێن رووەو گەشتێکی رۆحی نائاسایی. هەر لە ئێستاوە وەك جادووگەر ناسراون ـ دەی



باشە، جادووگەر وشەیەکە کە پڕ بووە لە کینە و لایەنگیری و ئازار و زیان و لە ڕێ لادان و حوکمی خۆڕایی و جۆرێك لە ستەمگەری. ئەم کتێبە سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەیە. جادووگەر کەسێك بووە کە لەگەڵ یاسا و ڕێسا و دەستوورە دامەزراوەکاندا کۆك و گونجاو نەبووە، بۆ هەمیشە هەوڵیداوە ئازا بێت و بوێرێت دوورتر بڕوات و پەرژینەکان بشکێنێت و بە ڕۆحێکی ئاهەنگسازییەوە ڕوو لە ژیان بکات، نوقمی خۆشەویستی بێت، شاد و خۆشبەختانە لەزەت لە زیندەگی بکات ئەو کاتەی سەرگەرمی ژیانە.

لە کتێبەکەتدا کارەکتەرێك دەڵێت، «هەر هەموو ژنەکان جادووگەرن». تۆ لێرەدا مەبەستەکەت لە ڕوانگەیەکی جوان و پۆزەتیڤەوە هاتووە؟

پاولۆ کۆییلۆ: هەڵبەت.. بەڵێ..بەڵێ..بەڵێ. هەموو خانمان ورد و بە سەلیقەترن سەبارەت بەو توانایەی کە هەیانە بۆ تێگەیشتن و هەستکردن بە کەسەکان و شتەکانی دەوروبەر، لەوەدا پێش پیاوان کەوتوون. کەواتە.. ئافرەتان بۆ هەزارەها ساڵە لە باری مرۆیی و ڕۆحییەوە کپ کراون و سەرکۆنە کراون، ئارەزووەکانیان خنکێندراون و جڵەوگیر کراون، ئەوەش بەوە کۆتایی هات کە ئەوان هەستی شەشەمیان پتر گەشە بکات، لە پاڵ پەیداکردنی بەهرەیەکی زۆرتر لە تێڕامان و بیرکردنەوەو خۆشەویستی. ئەوەشیان شتێك بوو کە ئێمە زۆر بە زەحمەت و ماوەیەکی درێژترمان ویست تاوەکو دانی پێدا بنێین و قایل بین بەوەی کە ئەوان و ئەو توانا دەگمەنەیان بەشێکە لە کۆمەڵگا. ئێمە هەوڵ دەدەین کە واقیع وەك دیوە فیزیکی و بەرجەستەکەی ببینین، بە واتا لەو دیوە مادییەی دوورتر و واوەتر ناڕوات. بەڵام ئەو شتەی کە بۆ هەمووومان پێویستە، کە ژنانیش دەگرێتەوە، پەرەپێدان و بەهێزکردنی زۆرتری ئەو ڕەهەندە مێینەیی و ژنانییەی ناو زاتی خۆمانە، کە دەکات وردبینی و سەلیقەو ژیری و پێشبینی، بە واتا کراوە بین بۆ بینین و دەرك پێکردنێکی تازە بە واقیع، کە دیارە بە گشتی لەوەدا ئافرەتان کراوەترن.



بۆچی تۆ وا بیر دەکەیتەوە کە زۆرینەی خەڵکی لە بەرامبەر ئەو ڕەهەند و ڕووە مێینەییەی یەزدان ـ دا هەست بە هەڕەشە دەکەن؟

پاولۆ کۆییلۆ: چونکە ئەوەیان وا دەخوازێت کە ئێمە پتر پێشوازی لە خۆشەویستی بکەین وەك ڕێبەر و پێشەنگێك بۆ ئاراستەکردنی هەموو ژیانمان. کەچی ئێمە وا ناکەین لە ترسی ئەوەی نەبا بتلێینەوە و ئازار بچێژین. لەوە دەچێت ئێمە قیبلەنوماکەمان بزر کرد بێت و جڵەوی خۆمان بۆ نەکرێت و نەزانین ڕووگەمان لە کوێیە. لەوە دەچێت پەلمان بگرن و بمانخەنە سەر ڕێگایەك کە نەزانین بۆ کوێمان دەبات.



بۆچی خۆشەویستی بۆ زۆربەمان وەها سەختگیر و کوشندەیە کە ناتوانین پەسندی بکەین و باوەشی بۆ بکەینەوە؟

پاولۆ کۆییلۆ: چونکە لە ناوئاخندا هەڵگری ئازار و تلانەوەیە. تۆش ئەوە دەزانیت. دەی باشە.. یەکەمیان ئەوەیە کە خۆشەویستی گرنگترین هەست و سۆزە لە ژیاندا. دووەمیان کە مەرجە بیزانین: خۆشەویستی خەسڵەتێکی تەواو کێویانەی هەیە، کە لەوەدایە رووەو بەهەشت یان دۆزەخ بمانبات. من ناڵێم کە خۆشەویستی بۆ هەمیشە دەتباتە بەهەشت. دەکرێت ژیانت ببێتە مۆتەکە و مێردەزمە و سواری سەرت بێت. بەڵام ئەوەش وتراوە کە خۆشەویستی ئەوە دەهێنێت ریسك بکەیت و مل لە تیغ بسوویت.

لە ناوئاخنی کتێبەکانی تۆدا بۆ هەمیشە کێشەی ئەو ئەگەرە لە ئارادا هەیە کە مرۆڤ ئەو رێڕەوە رۆحانییە بدۆڕێنێت گەر کەوتە ناو خۆشەویستییەکی رۆمانتیکی چ وەك نێر و چ وەك مێ؟

پاولۆ کۆییلۆ: بە دڵنیاییەوە. بەڵێ..وایە. ئەوەشیان شتێك نیە مرۆڤ لێی بترسێت.

بەڵام لەوە دەچێت کارەکتەرەکانت هەر بە ڕاستی کەم و زۆر ئەو ترسەیان هەبێت؟

پاولۆ کۆییلۆ: بەڵێ..چونکە ئێمە وەك بنیادەم ترسێکی وامان لە دڵدایە کە لەمیانەی خۆشەویستی رۆمانتیکی رۆحی خۆمان لە دەست بدەین. بەڵام لە کۆتایی رۆژدا ـ زۆر چاکە..بسرەوەو ئارام بە..خۆش رابوێرە چونکە دوا جار ژیان و زیندەگی هەر وا بووە.

هەروەها لەم کتێبەی تۆدا مۆسیقا فاکتەرێکی مەزنە. ئەرێ تۆ سەما دەکەیت؟

پاولۆ کۆییلۆ: هەڵبەت سەما دەکەم. ئەو کاتەی سەما دەکەم بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە. هەنووکە کە لێرەم.. بە هەموو بوونێکمەوە لێرەم. کە لە ناو گەرمەی سەمادا بم، بە تەواوی لەوێندەرم. تۆ تێمدەگەیت؟ ئەو هەستەش لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە من لە خۆم دوور کەوتبێتمەوە. بە واتا رۆحم لە تەك فریشتەکاندا سەما دەکات و لەشیشم لە تەك ژنەکەمدا سەما دەکات.

ئەوە چ مۆسیقایەکە کە سەمات پێدەکات؟
پاولۆ کۆییلۆ: ئەها، نەوەی من..هەمووومان لەسەر مۆسیقای «رۆك ئاند رۆڵ» ی کلاسیك راهاتبووین. ئەگەر ئێستا بچیتە ناو هەر یانەیەکی سەمای شەوانە چیتر گوێت لەم جۆرە مۆسیقایە نابێت. بە تەنها گوێت لەو زرموکوتە دەبێت: بانگ بانگ.. بووم بووم، کەواتە من ناچارم لەسەر ئەم مۆسیقایە سەما بکەم. من نازانم کێ گۆرانی دەڵێت. ناشزانم جێبەجێکەر کێیە و کۆی باندەکە کێ رایدەپەڕێنێت. من تەنها حەز دەکەم بچم بۆ یانەکە و لەوێندەرێ سەما بکەم، چونکە من هەست دەکەم لە رووی سۆزدارییەوە سەماکردن بە تەواوی هاوسەنگیم دەپارێزێت. جار و بار زۆر پێویستە لە رێگەی سەماوە کۆنترۆڵی خۆمان لە دەست بدەین، بە لای کەمەوە هەفتەی جارێك.

ئەو کاتەی کە لەماڵەوەیت مۆسیقا دەخەیتە سەر ...
پاولۆ کۆییلۆ: ئەوەیان شتێکی تەواو جیاوازە..بەڵێ. وەلێ جیاوازییەکەی لەوەدایە، بۆ نمونە.. من ناتوانم بنووسم و لە هەمان کاتدا گوێ لە مۆسیقا یان گۆرانی بگرم. چونکە ئەو کاتە مۆسیقاکە ئەوەندە بەهێز دەبێت کە لە نووسین رامدەگرێت و ناچارم دەکات بەوەی کە گوێی بۆ رادێرم. کەواتە من ناتوانم گوێ لە مۆسیقایەکی وەك جۆری «موزارت» بگرم.. تۆ دەیزانیت؟ چونکە ئەو جۆرە مۆسیقایە ئاهەنگسازە و دەمخاتە سەر هەوای شان بادان. نەخێر..نا. سەبارەت بە خۆم مۆسیقا داوام لێدەکات کە بە تەواوی خۆمی بۆ تەرخان بکەم.

لە کارەکانتدا زۆر جاران ئاماژە بەو ناکۆکییە دەکەیت کە لە نێوان یاسا و رێساکانی کڵێسا و فەرمووده و رێنماییەکانی ئینجیل ـ دا هەیە. تۆ گەرەکتە شتێك سەبارەت بە ریاکاری و دووڕوویی لەوێدا بدرکێنیت؟
پاولۆ کۆییلۆ: من بە تەنها دەتوانم قسە لەسەر ئایینەکەی خۆم بکەم کە کاسۆلیکی ـ م. من کاسۆلیکیم چونکە خۆم هەڵمبژاردووە. هەروەها دەچم بۆ نوێژی بە کۆمەڵ لە کڵێسا کە هەمدیس خۆم هەڵمبژاردووە. ئەوەیان کەوتۆتە دەرەوەی ویستی ئازادانەی خۆم. بەڵام دواتر کە من لە هەندێك جاردا بەر یەککەوتنێکی مرۆیانە دەبینم کە بە تەنها لە چوارچێوەی سرووت و نەریتێکی پیرۆزدا رێزی دەگیرێت، ئەوسا بە خۆت دەڵێیت: ئۆە..وای خودای من، ئەوەیان هەمان ئەو شتە نییە کە عیسا پێغەمبەر وتوویەتی. عیسا زۆر کراوەتر بوو ـ پڕ بوو لە خۆشی و شادی و ژیان. چونکە ئەم کەسێك بوو بۆ هەمیشە لە گەشت و گەڕان نەدەکەوت، ژنان بە دەورییەوە بوون، شەرابی دەخواردەوە. تۆ دەزانیت کە ئەم گفتوگۆی سەیر و مەزنی هەبوو لە تەك مرید و شاگردەکان و شوێنکەوتووەکانی.
لەو کڵێسایەی کە هەنووکە من پێوەی پەیوەستم،





زۆر لە جاران پتر، سەردارەکانی دژ بە هەر ڕێڕەوێکی سرووشتیانەی مرۆڤدۆستی و مرۆڤپەروەرین.
ئەم پاپا تازەیەی کە هاتووە کارەساتە، با روونتر بدوێم.. من نیازم نییە بەرگری لە پاپایەك بکەم،
بۆ نمونە.. کە دژ بە بەکارهێنانی «کۆندۆم» وەستاوەتەوە. من ئامادە نیم بەرگری لە پاپایەك
بکەم کە وا مەزەندە بکات کە هێشتا لە سەدەکانی ناوەراستدا دەژین و بڕوای وا بێت کە بیرو
باوەڕی کاسۆلیکی تاقانەیە و هەر خۆمان راستین. رەنگە هەنووکە تۆ لێم بپرسیت: تۆ بۆچی
وەك کاسۆلیکی خۆت دەناسێنێت گەر لەگەڵ پاپا و قەشەو سەرۆك قەشەکان و پیاوانی ناو
کڵێساکە یەکدی ناگرنەوە؟ زۆر چاکە.. وەڵامی من ئەوەیە: چونکە بۆ من ئایینەکەم زۆر
بایەخدارترە لەو پیاوانەی کە کاری تێدا دەکەن و ئاراستەی دەکەن.
بەڵام سرووتەکانی نوێژی بە کۆمەڵ لە کڵێسا و فەرموودەکانی عیسا لە لای من
پەسندن. ئەوە ئێمەین کە پاپامان هێشتۆتەوە. نوێژە بە کۆمەڵەکە بۆ من راز و
نهێنی تێدایە، ئەوەش بۆ من سرووتێکی تەواو و بێ کەموکوڕییە.

لەسەر ئاستی هەموو جیهاندا ململانێ و ناکۆکی ئایینی تین و تاوی پتری
سەندووە. ئەوەیان چۆن وای کردووە خەڵکی پتر برسی کتێبەکانی تۆ بن، کە
خەڵکی سەر بە مەزهەب و ئایینی جیاواز پەنای بۆ دەبەن؟
پاولۆ کۆییلۆ: من نازانم بۆچی کتێبەکانی من لای ئەو خەڵکە پەسندن، چونکە من
بۆ ئەوە دەنووسم تاوەکو لە خۆم تێبگەم. ئەو کاتەی کە من «جادووگەر»م نووسی،
واو، من هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەم لە مێشکدا هەبوو، وەك مەتەڵ. کەواتە من
دەبوو هەموویان پێکەوە گرێ بدەم تاوەکو هەموو وێنەکە بە تەواوی ببینم و
تێبگەم. کەواتە ئەو کاتەی من دەنووسم، ئەوسا روون و ئاشکراتر خۆم دەبینم.
من کە دەنووسم زۆر گەرماوگەرم و خۆڕسك سەرگەرمی ئەو کارەم. من
بابەتەکانی خۆم لەو شتانەوە دادەتاشم کە هانم دەدەن و دەموروژێنن و دنەم
دەدەن. ئەو کاتە کتێبەکانم فرۆشی لە سەرتۆپی لیستەکەدایە. ئەوەشیان بۆچی؟
زۆر چاکە.. من نایزانم بۆ. لەوانەشە ئەو رۆژەی کە من نهێنییەکەی دەزانم، ببێتە
مایەی دۆڕانی ئەو سەلیقەیە و گەرموگوڕی و خۆرسکییەم لە نووسیندا. ئەوسا
ناچار چەند بارە خۆم دووپات بکەمەوە. ئەو کاتە لە خۆم ون و نامۆ دەبم چونکە
کتێبەکەم چیتر نابێتە ئامراز و ڕێگەیەك بۆ خۆدۆزینەوە. کتێبەکە بە تەنها وەك
بەرهەمێك یان کاڵایەك دەکەوێتە بەر چاوان. ئەوساش بۆ من بە تەواوی مانای

خۆی دەدۆڕێنێت.

ئایا ئەو دۆخ و شێواز و زەمینەسازییە چین کە وا لە تۆ دەکەن لە رووی فیزیکی و رۆحییەوە ئامادەی نووسین بیت؟ هەندێك لەو سرووت و نەریتانە چین کە تۆ بۆ نووسین گڕ دەدەن و پێویستت پێیانە؟

پاولۆ کۆییلۆ: باشترین رێگا بۆ ئەوەی ئیلهام و سرووش بۆ نووسین بخوازیت ـ کە تایبەت بە خۆم بێت ـ بینینی خەڵکە. کە تۆ روو بە رووی خەڵکی دەبیتەوە فێر دەبیت، گوێ دەگریت. هەندێك جاریش گوێت لە خۆت دەبێت. تۆ دەکەویتە بەردەم ئاوێنەوە. تۆ باشتر خۆت دەبینی. من دوو ساڵ جارێك کتێبێك دەنووسم. من بە یەك مانگ ئەو کتێبە تەواو دەکەم چونکە پێشتر کتێبەکە لە ناو رۆحمدا تەواو بووەو نووسراوە. هەڵبەت دواتر.. وەك هەلومەرجێکی مرۆیی من تێکەڵ بە ژیان دەبمەوە و بەشی خۆم لەو زیندەگییە لە تەك ئەوانیدیکەدا ڕێدەخەم. چونکە تۆ ناچاریت بەوەی پشکی ئەو بەشدارییەت هەبێت. گەر بەشدار نەبیت، ئیدی ون دەبیت.

ئەی سەبارەت بەو پەڕی پەلەوەرە چی دەڵێیت؟ گوایە دەڵێن کە تۆ چاوەڕوان دەبیت بۆ ئەوەی ئەو پەڕە سپییە ببینیت بەر لەوەی بنووسیت...

پاولۆ کۆییلۆ: ئۆو.. پەڕە سپییەکە. وایە.. وایە. ئەوەیان خوویەکە کە خۆم دروستم کرد. ئەو کاتەی کە تەمەنم چل ساڵ بوو، هێشتا هیچ کتێبێکم بڵاو نەکردبۆوە. بەڵام خەونێکم هەبوو کە ببم بە نووسەر. من ئەو حەجەی خۆم بەجێگەیاند. بۆ ماوەی پەنجاو شەش رۆژ بە پیادەڕەوی رێگەم گرتە بەر بەو نیازەی بچمە سەر مەزاری «سەینت جەیمز ـ ی پیرو پیاوچاك» لە سانتیاگۆی ـ ئیسپانیا. ئەوسا وتم، « ئاە خودای من.. خەونی من ئەوەیە ببم بە نووسەر، بەڵام من هەمیشە دوای دەخەم.»

هەر ئەو کات بە خۆمم وت، « ئەگەر ئەمڕۆکە من پەڕی سپی پەلەوەرێك ببینم، ئەوەیان دەبێت بە هێما و نیشانەی ئەوەی کە خودا دەیخاتە بەر چاوی من تاوەکو من کتێبێکی تازە بنووسم.» هەر ئەو وەختە من پەڕێکی سپیم بینی بەسەر پەنجەرەی دوکانێکەوە. هەر لەو ساوە.. لە مانگی یەکەمی هەر دووەمین ساڵێکدا، واتا ساڵ نا ساڵێك من پێویستیم بەوەیە کە پەڕێکی سپی ببینم. ئەو رۆژەی کە دەیبینم دەستوبرد بۆ نووسین ئامادە دەبم. هەڵبەتە من رۆژانە پەڕی سپی هەڵوەریوی باڵندەکان دەبینم، بەڵام بینینی پەڕێکی سپی لە مانگی بەفرانباردا رێك تایبەت بە خۆمە. هەڵبەتە من پەڕێکی سپی زۆر و زەبەندم لە ناو بەرگی نامەکاندا پێدەگەن کە خوێنەرەکانم بۆم دەنێرن. بەڵام من گەرەکمە پەڕە سپییەکەی خۆم بدۆزمەوە.





دوای ئەوە تۆ خەریکی چی دەبیت؟
پاولۆ کۆییلۆ: هیچ.

هەست دەکەم ئەوەیان جوان بێت!
پاولۆ کۆییلۆ: من لەم قۆناغەدا خەریکی هیچ نیم بێجگە لە ژیان، بە تەنها سەرگەرمی زیندەگیم و هیچی دیکە، یان خۆم دەدەمە دەست «با» تاوەکو بە کەیفی خۆی بمبات. پەرە سپییەکەی من لە ئایندەدا هەر دەبێت لە بەفرانباری ٢٠٠٨ دا دەربکەوێتەوە. تا ئەو حەلە من زۆر چاك خەریکی خۆمم.. خۆش دەگوزەرێت، من دەژیم. خەڵکی دەبینم. من سەرگەرمی سەما دەبم. هەرچییەکی کە خۆم حەزی پێبکەم.. درێغی ناکەم و دەیکەم.

دوا پرسیارم: بۆ تۆ خودا چی دەگەیەنێت؟
پاولۆ کۆییلۆ: خودا کردارێکە بۆ من، فەرمانێکە و تافێکە. خودا رەفتار و کردەوەیەکە، جوڵەیە.. ئیش و کارێکە. بەڵێ خودا ـ تەنها کردارە. راستی ناتوانیت پێناسەی بکەیت.
ئەو کاتەی مووسا پێغەمبەر دەپرسێت، « تۆ کێیت؟» یەزدان دەڵێت،» من منم.»
ئەم ناڵێت من ئەمەو یان ئەوەم یان واو وام. تەنها بە وشەیەك دەژنەوێت،» منم.»
کەواتە.. من وا مەزەندە دەکەم ئەوەیان پوختترین پێناسەیە، ئاخۆ تۆش دەیزانیت؟
ئەم ئەوەیە!

*بەرواری سازاندنی دیدار: ٢٠٠٦

سەرچاوە:
**PAULO COELHO**
**The WITCH of PORTOBELLO**
**A NOVEL**






# ئەتلەسی هەورەکان

**ئاودێر کاکەی فەلاح**

دوو گرنگترین فیلمی ساڵانی نەوەتەکانی چەرخی بیستەم، فیلمی( لۆلا ڕادەکات- Lola rennt ـ

بەرهەمهێنانی ئەڵمانیا ساڵی ١٩٩٨) لەگەڵ فیلمی (ماتریکسە -- The Matrix ـ

ئەمەریکا - ١٩٩٩). ئەم دوو فیلمە کەتەنها ساڵێکیان بەینە، پێشبینییەکی سەیریان بۆ داهاتووی هونەری سینەما تیادایە و لەهەمان کاتدا کۆتایی نەك تەنها بە یەکەیەکی زەمەنی (چەرخی بیستەم) دێنن، بەڵکو چەرخێکی سینەماییش



بەرپێدەکەن و زۆربەی فیلمەکانی
پێشخۆیان وەك فیلمی کۆن یان
کلاسیك بەجێدەهێڵن.
هەردوو دەرهێنەری فیلمی ماتریکس
(ئەوسا دوو برایانی ئەندی و لاری
واکۆسکی، بەڵام ئێستا لارییان جنسی
خۆی گۆڕیوە و بووە بە ژن و ناوی
گۆڕیوە بە لانا)، بەوتازەگەریتییە
تەکنیکیانەی کە هێنایانە ناو
سینەماوە، چۆنێتی سەیرکردنی
فیلمیان گۆڕی و چوارچێوە باوەکانی
سینەمایەکی پێشخۆیانیان تێکشکاند.
هەرچەندە ئەو تەکنیکانەی
بەتایبەت لەدیمەنە ئەکشینەکاندا
بەکاریان هێنابوو، دەگەڕانەوە بۆ
سەرەتاکانی دوروستبوونی سینەما،
بەڵام بەوشێوەی بەکارهێنانە تا ئەو
ساتە کەس بەرچاوی نەکەوتبوون.
هەروەها فیلمی (لۆلا ڕادەکات)یش،
لە سیناریۆ و دەرهێنانی دەرهێنەری
ئەڵمانی (تۆم تیکڤەر)، بەو تەکنیکە
پڕ فەنتازییانەی لە هونەری گێڕانەوەدا
بەکارهێنرابوون، ئاستی تەماشاکردن
و لەهەمان کاتدا قبووڵکردنی
چیرۆکێکیان لەسەر پەردەی سینەمادا
فراوانتر کرد.
هەرچەندە ئەم دوو فیلمە وەك
لایەنی زمانی سینەما و هونەری
گێڕانەوە لە ئاستێکی هێجگار بەرزدان، بەڵام وەك لەسەرەتادا
وتمان، پێشبینییەکی سەیری دوارۆژێکی تاریکی ئەم هونەرەیان
لەخۆگرتووە. دوارۆژێك بۆ ئەم فیلمدۆستانەی ئێستا زۆر دڵخۆشکەر
نابێت.
هەردوو ئەم فیلمە یەکەم نموونەی زەق و گرنگی ئەو
گۆڕانکاریانەن کە وردە وردە بە سەر هونەری سینەمادا دێن.
نامەوێت لێرەدا باسی لەناوچوونی یان مردنی ئەم هونەرە بکەم،
بەڵام ئەم دوو فیلمە سەرەتای چاندنی
تۆوی گۆڕانێکی سەرتاسەری سینەما
بوون. بۆ یەکەمین جار لەناوچوونی
ئەم هونەرەیان (بەم
شێوەیەی کە ئێستا هەیە)
پێشاندان.
ئەم گۆڕانکارییەش
لە خاڵێکی سەرەکیدا
خۆیانپێشاندا، ئەوەش
بونیادی ئەم دوو
فیلمەیە، کە زیاتر لە
چۆنێتی بەرێوەچوونی یاری
کۆمپیوتەرەوە نزیکترە وەك لە
فیلمەوە. هەرچەندە زمانی گێڕانەوە
زمانێکی سینەماییە، بەڵام ڕوحیەتی
فیلمەکە ڕوحیەتی یاری کۆمپیوتەرە
و تا ئەو ساتە بە سینەما نامۆ
بووە.
لە (لۆلا ڕادەکات) دا چیرۆکی
فیلمەکە سێ جار دووبارە
دەبێتەوە. جاری یەکەم



(لۆلا) کچەپاڵەوانی فیلمەکە دوای نزیکەی ٣٠ دەقیقە دەکوژرێت، بەڵام وەك یاری کۆمپیوتەر فیگورەکە ڕوحێکی تری هەیە و زیندوودەبێتەوە و دیسانەوە چیرۆکەکە دووبارەدەبێتەوە. ئەم جارەیان کوڕەپاڵەوانەکە دەبێت بە ژێر سەیارەوە، دیسانەوە زیندوودەبێتەوە (چونکە لۆلا خۆشیدەوێت!) ، تا بۆ جاری سێهەم هەردووکیان بە سەرکەوتووی دەگەن بەیەك و فیلمەکە تەواودەبێت یان باشتربڵێین یارییەکە دەبەنەوە.
لەم دووبارەبوونەوەیەشدا لۆلا (وەك یاریکەرێکی سەر کۆمپیوتەر) لە ئەزموونەکانی چیرۆکەکەی پێشووی شت فێردەبێت و هەڵەکان دووبارەناکاتەوە.
ئەوەی ئاشکرایە ئەم شێوەی چیرۆك دووبارەکردنەوەیە لەسینەمادا بۆ یەکەمجار لەم فیلمەدا نەبووە، بەڵکو دەرهێنەری پۆلۆنی ناودار (کیشلۆفسکی) ئەم تەکنیکەی لە فیلمی (بەڕێکەوت - **Przypadek** - پۆلۆنیا - ١٩٨١ ) دا بەکارهێناوە. وادیارە (تۆم تیکڤەر)، هەرچەندە خۆی دانی پیادانانێت، لە (لۆلا ڕادەکات) دا زۆر سوودی لە فیلمەکەی (کیشلۆفسکی) بینیوە. نەك تەنها چۆنێتی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بەسێ شێوەی جیاواز لە (لۆلا ڕادەکات) دا پراکتیزە کراوە، بەڵکو هەندێك ڕەگەزی بەستنەوەی چیرۆکەکان لە فیلمەکەی (کیشلۆفسکی) دا هەن، کە (تۆم تیکڤەر) وەکوخۆی وەریگرتوون.
سەرەڕای ئەم لەیەکچوونانەش، خاڵێك جێی سەرسووڕمان بێت ئەوەیە، لەگەڵ بینینی فیلمە پۆلۆنیەکەدا هیچ هەستێك بەوەناکەیت کە داهاتووی سینەما لە مەترسیدا بێت، (کیشلۆفسکی) یاری بە قەدەری هیچ کەسێك و هیچ شتێك ناکات، بەڵکو قەدەریەت و بێمانایی ژیانمان لە پۆلۆنیایەکدا پێشاندەدات کە بەدەستی سیستەمێکی تۆتالیتاریزمییەوە گیریخواردووە. سەیرکردنێکی فەلسەفی قووڵە بە چاوێکی سینەماییانە بۆ بارودۆخی پۆلۆنیای سەرەتای هەشتاکانی چەرخی ڕابردوو.
کاریگەری (کیشلۆفسکی) لەسەر (تیکڤەر) چەند ساڵێك دوای (لۆلا رادەکات) بەشێوەیەکی ڕوونتر و ڕاستەوخۆتر دەردەکەوێت، کاتێك (تیکڤەر) هەڵسا بە فیلمکردنی سیناریۆیەکی (کیشلۆفسکی). فیلمی ( بەهەشت - **Heaven** - لەبەرهەمهێنانی ئەڵمانیا و ئەمەریکا - ٢٠٠٢) بەشێکبوو لە پرۆژەیەکی گەورە کە دەرهێنەری پۆلۆنی تا لەژیانیدا بوو نەیتوانی بەئەنجامی بگەیەنێت.
فیلمی (ماتریکس)یش بەهەمان شێوەی (لۆلا ڕادەکات) لەسەر فەلسەفەی یاری کۆمپیوتەر دروستبووە. زۆربەی کات پاڵەوانەکە (نیۆ) دووچاری هەڵبژاردن لەنێوان دوو



ئاراستەدا دەبێتەوە، ئەگەر بەملادا بڕوات، ئەوە ئاوا دەبێت، ئەگەر بەولادا بڕوات، ئەوا ئەمەی لێبەسەردێت.
ئەم حەبە بخوات، دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی، بەڵام حەبەکەی تر بخوات، شتی زۆر سەیر و سەمەرەی بەسەردا دێت. لەنزیکەی کۆتایی فیلمەکەشدا (نیۆ) دەکوژرێت، بەڵام (هەروەك فیلمی لۆلا ڕادەکات) کچێك خۆشیدەوێت و بەگوێیدا دەچرپێنێت کە نابێت بمرێت، چونکە وەك وتمان خۆشیدەوێت! (نیۆ) یەکسەر زیندوو دەبێتەوە و بەسەر دوژمنەکانیدا سەردەکەوێت و لەناویاندەبات. لەم دوو فیلمەدا هەروەك یاری کۆمپیوتەر مردن نییە، بەڵکو چەند ڕوحێك هەیە کە یاریان پێدەکرێت، ئەگەر تەواویشبوون، دەتوانرێت یارێکە سەرلەنوێ دەستپێبکرێتەوە.
ئەم دوو فیلمە زۆر بە ڕوونی سەرەتاکانی گۆڕانێکی سینەماییان پێشاندااین. من دڵنیام لەوەی کە ئەگەری بوونی سینەما لەداهاتوودا ئەگەرێکە پەیوەستدەبێت بە یاری کۆمپیوتەرەوە. چارەنووسی ئەم هونەرە لە ژێر ڕەحمی چەند نەوەیەکدا دەبێت کە بەم یاریانە بەخێوکراوان.
دوای ئەم هاوبەشیانەی ئەم دوو فیلمە پێکەوە هەیانە زۆر جێگای سەرسوڕمان نییە کاتێك ببینین هەرسێ دەرهێنەری ئەم دوو فیلمە پێکەوە فیلمێك دروستبکەن. (ئەتلەسی هەورەکان -
Cloud Atlas -

لەبەرهەمهێنانی ئەمەریکا و ئەڵمانیا - ٢٠١٢) نوێترین کاری سینەمایی (تۆم تیکڤەر لەگەڵ لانا و ئەندی واکۆسکیە). چیرۆکی فیلمەکە بەفیلمکردنی ڕۆمانی نووسەری ناوداری ئینگلیزی (دەیڤید میتچیلە). ئەم ڕۆمانە کە لەساڵی ٢٠٠٤ دا بڵاوبۆوە و لەزۆر وڵاتی دونیادا چووە لیستی کتێبە باشفرۆشراوەکانەوە، مۆرکی ئەوەی پێوەدیاربوو کە ستەمە بتوانرێت بە فیلم بکرێت. هەڵبەتە ئەم بۆچوونەش هەروا لەخۆڕا نەبووە و دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی: یەکەمیان لەبەر خودی بونیادی ڕۆمانەکەیە، کە بونیادێکی تابڵێی ئاڵۆزە. ڕۆمانەکە لە شەش چیرۆکی جیاواز پێکهاتووە، ئەم چیرۆکانەش کراون بە یانزدە بەشەوە. بونیادی ئەم بەشانەش لەسەر شێوەی پالیندرۆم دارێژراوە (پالیندرۆم وشەیەکە لەڕاستەوە بۆ چەپ بیخوێنیتەوە هەمان وشە و مانا بێت وەکو لە چەپیشەوە بۆ ڕاست. بۆ نموونە وەك وشەی: « نان « کە لە هەردوو سەرەوە هەر بە نان دەخوێنرێتەوە). پێنج چیرۆك لەم چیرۆکانە کراون بە دوو بەشەوە. نووسەر بەسەرە بەشی یەکەمیان



دەیانگێڕێتەوە تاکو دەگەین بە چیرۆکی شەشەم، کە نەیکردوە بە دوو بەشەوە و بەیەك جار دەیگێڕێتەوە. لەپاشدا بەشی دووهەمی چیرۆکی پێنجەم دەگێڕێتەوە و بەشەکانی تریش بەم یەك بەدوای یەکهاتنەدا دەگێڕیتەوە تاکو ڕۆمانەکە بە بەشی دووهەمی چیرۆکی یەکەم کۆتای دێت.

نووسەر هەر چیرۆکەشی بە جۆرێکی جیاوازی نووسینی ئەدەبی داڕشتووە. چیرۆکێکیان لەسەر شێوازی نووسینەوەی یاداشتی ڕۆژانەیە، یەکێکیان وەك ئەدەبی نامەیە، یەکێکی تریان وەك ڕۆمانی تاوان، چیرۆکێکیان وەك پەخشان داڕێژراوە، چیرۆکێکی تریان لەسەر شێوەی چاوپێکەوتنە، دانەیەکیانیش بەشێوازی مۆنۆلۆگ دەگێڕێتەوە.
هۆی دووهەمی زەحمەتی بەفیلمکردنی ڕۆمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی ڕوودانی چیرۆکەکان، کەهەریەکەیان لە سەردەمێکی جیاوازدا ڕوودەدەن و بە هەموویان باسی زیاد لە پێنج سەدەی مێژووی مرۆڤایەتی دەکەن. ئەم خاڵەش تابڵێیت زەحمەتە بۆ فیلم، چونکە فیلم پەیوەستە بە یەکەیەکی کاتی دیاریکراوی کورتەوە و پێویستە هەربەیەکجار تەماشابکرێت. بەڵام ڕۆمانێکی وەك (ئەتلەسی هەورەکان) کە بە ئینگلیزێکەی ٥٤٤ لاپەڕەیە، ستەمە لە چەند سەعاتێکی کەمدا بخوێنرێتەوە.
هەربەوپێیە فیلمێکی سەرکەوتو سەختە بتوانێت باس لە چەند چیرۆکێکی جیاواز بکات کە لەچەند سەدەیەکی جیاوازدا ڕوودەدەن. چونکە ئەو کاتە بەستنەوەی چیرۆك و کاتەکان پێکەوە زەحمەت دەبن، لەگەڵ بازداندا لەم چیرۆکەوە بۆ ئەو چیرۆك و لەم سەدەیەوە بۆ ئەو سەدە، دیقەتی بینەر بۆ فیلمەکە کەم دەبێتەوە.
لەبەر ئەم دوو هۆیە دەرهێنەرانی فیلمەکە هاتوون دوو چارەسەری زیرەکانەیان بۆ ئەم گیروگرفتانە دۆزیوەتەوە، یەکەمیان: هاتوون ئەم شەش چیرۆکەیان تێکەڵاو کردووە. ئەو بونیادی پالیندرۆمەیان گۆڕیوە بۆ بونیادێك کە وەك تابلۆیەکی مۆزایك وایە لەپارچەی بچووك بچووك پێکهاتبێت. دووهەمیش: هاتوون هەمان کاستی فیلمەکەیان هێناوە و لە هەموو چیرۆکەکاندا ڕۆلیان پێداون، بەڵام هەڵبەتە ڕۆلی جیاواز جیاواز. بۆ نموونە (تۆم هانکس) لە چیرۆکێکدا ڕۆلی سەرەکی دەبینێت، بەڵام لە چیرۆکێکی تردا ڕۆلێکی لاوەکی پێدراوە. یان (هێلی بێری) لە بەشێکدا ڕۆلی ئافرەتێکی ڕۆژنامەنووس دەبینێت، لەبەشێکی تردا بۆ چەند ساتێك وەك کابرایەکی چینی دەردەکەوێت. هەموو کاستی فیلمەکە چەندین ڕۆلی جیاوازیان پێدراوە، ڕەگەزی ژن و پیاو، تەمەنی کارەکتەرەکان و ڕەنگی پێستی ئەکتەرەکان لەڕۆلێکەوە بۆ ڕۆلێکی تر دەگۆڕێن.
لەبەر ئەوەی بیرۆکەی بنەڕەتی ڕۆمانەکە باس لەو پەیوەندیە



سەیرە قەدەرییە دەکات کە مرۆڤە جیاوازەکان لە گشت سەردەمەکانی مێژوودا پێکەوە هەیانە، هەروەها کار و هەڵسوکەوت و بڕیارەکانی نەوەیەك، کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لەسەر نەوەکانی داهاتووش، هەر بۆیە دەرهێنەرانی فیلمەکە لە ڕێگای تێکەڵاوکردن و بەمۆزایك کردنی چیرۆکەکانەوە و هەروەها پێدانی ڕۆڵی جیاواز بە هەمان ئەکتەر لە چەند چیرۆکێکی جیاوازدا، توانیویانە پەیوەندییەکی سیحری لەنێوان چیرۆك و سەردەمە جیوازەکاندا دروستبکەن و بیرۆکە سەرەکییەکەی ڕۆمانەکە بەم شێوە فیلمییە بگەیەنن.
لەکاتی سەیرکردنی فیلمەکەدا بەبەردەوامی هەست بەنزیکی کارەکتەرەکان لەیەکەوە دەکەیت و بازدانە کاتێکانیش بەشێوەیەکی سیحری بوونیان نامێنێت. هەستدەکەیت چیرۆکە جیاوازەکانی سەردەمە لەیەکدوورەکان ئێستا لەیەککاتدا پێکەوە ڕوودەدەن. (تۆم تیکڤەر) لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: « ئەم کارەی ئێمە بەفیلمکردنی ڕۆمانەکەی (دەیڤید میتچیل) نییە، بەڵکو بەفیلمکردنی کاریگەری و ڕەنگدانەوەی ڕۆمانەکەیە لەمێشکی خوێنەردا.»
هەرچۆن ڕۆمانەکە تاقیکردنەوەی شێوازە ئەدەبیە جیاوازەکانە و یاریکردنە پێیان، بەهەمان شێوەش دەرهێنەرانی فیلمەکە هاتوون هەر چیرۆکێکی فیلمەکەیان بە ژانرەیەکی سینەمایی جیاواز دەرهێناوە، وەك: خەیاڵی زانستی، فیلمی فەنتازی، ثریللەر، کۆمیدیا، میلۆدراما و لەگەڵ فیلمی ئەدڤێنچەردا. دەرهێنەرانی فیلمەکە لەم ڕێگایەوە توانیویانە بێجگە لە ڕوحیەتی ڕۆمانەکە، فێڵەکانی نووسین و تەکنیکە ئاڵۆزەکانی گێڕانەوەش بەبینەر بگەیەنن و لەهەمان کاتیشدا مۆرکێکی تایبەتی سینەماییشی پێببەخشن.
ئەم یاریکردنە بە ڕەهەندە جیاکانی کارێکی هونەری بەتایبەت بۆ (تۆم تیکڤەر) شتێکی نوێ نییە و لە (لۆلا ڕادەکات) دا هەوڵی لەم چەشنەی داوە. خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: « چونکە چیرۆکی فیلمەکەی (لۆلا) هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی هەل و شانسە جیاوازەکانی ژیان بوو، بۆیە گرنگ بوو زمانێکی سینەماییش بدۆزمەوە تاکو ئەم بیرۆکانە بەرجەستە بکات.» ئەگەر تەماشای (لۆلا ڕادەکات) بکەین، دەبینین فیلمەکە زۆربەی دەربڕینە سینەمایی و هونەرێکانی لەخۆگرتووە، وەك: بەکارهێنانی کامێرای سینەمایی، بەکارهێنانی کامێرای ڤیدیۆ، هونەری فۆتۆگرافی، فیلمی کارتۆن، گرافیك، فیلمی ڕەنگاوڕەنگ و فیلمی ڕەشوسپی و چەندین بواری تریش.
هەرچەندە ڕۆمانی (ئەتلەسی هەورەکان) وەك وتمان زۆر سەختە بکرێت



به فیلم، بەڵام لەبەرئەوەی دونیای ڕۆمانەکە لە دونیای کارە سینەماییەکانی (تۆم تیکڤەر و هەردوو خوشك و برایانی واکۆسکییەوە) زۆر نزیکە، بۆیە بۆ ئەم فیلمسازانە ئاسانتربووە شاکارێکی ئەدەبی وا بۆ سینەما وەرگێڕن.
گشت فیلمەکانی (تۆم تیکڤەر) گەڕانن بە دوای ئەو پەتە نەبینراوە سیحراوییەی کە شتەکان و مرۆڤەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. لەم گەڕانەشدا هەردوو چەمکی ڕێکەوت و قەدەر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. کارەکتەری فیلمەکانی هەمیشە لە ژێر فشاردان و ژیانیان لە مەترسیدایە، بۆیە دەبێت خێرا دەستبەکاربن و خۆیان ڕزگار بکەن.
هەروەها دونیای فیلمی (ماتریکس) یش بەهەر سێ بەشەکەیەوە، هەر پشکنینی ئەم بابەتانەیە. مرۆڤەکان دیلن و پێویستە شۆڕش دژی ئامێرەکان بکەن تاکو ڕزگاریان ببێت. بەرەی چاك بەرامبەر بە بەرەی خراپ زۆر بە ڕوونی و بە شێوەیەکی زەق پیشاندەدرێت. بەرەوڕووبوونەوە و دژایەتیکردنی (ئارەزوو بۆ دەستەڵات) بەمانا نیتشەیەکەی، تەوەرەیەکی گرنگی ئەم فیلمانەیە و هەروەها کۆڵەکەیەکی سەرەکی ڕۆمانەکەشە.
پێش ئەوەی لە ٢١ دیسێمبەری ساڵی ٢٠١٢ دا ڕۆژژمێری مایاکان تەواو ببێت، زۆر کەس لە جیهاندا ئەم بەروارەیان بە کۆتایی دونیا لەقەڵەمدەدا، بەڵام کە ڕۆژی دوای ئەوە دونیا هەر مابوو، بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بەم ئەفسانەیەش نەبوو، هەر هەستێکی سەیریان بە خۆشی دەکرد. فیلمی (ماتریکس و لۆلا ڕادەکات) یش جۆرێك بوون لە ڕۆژژمێری مایاکان بۆ سینەما، کە کۆتاییان بە سەردەمێك هێنا. بەڵام ئێستا کە دەبینین هەمان فیلمسازانی ئەم دوو فیلمە پێکەوە کارێکی وەك (ئەتلەسی هەورەکان) ئەنجامدەدەن، ڕۆژی دوای ئەوە زەردەخەنەیەك دەمانگرێت و هەستدەکەین جارێ کۆتایی هونەری سینەما ناهاتووە و دواخراوە بۆ کاتێکی تر.

یانوەری ٢٠١٣

